# شێوە و ناوەڕۆك

کۆمەڵێك لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی

نووسینی:

ئومێد ئاشنا

ناوی کتێب: شێوە و ناوەڕۆک - کۆمەڵێک لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی
نووسینی: ئومێد ئاشنا
بڵاوکراوەی ئاراس - ژمارە: ٦٤٣
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: کارزان عەبدولحەمید
بەرگ: مریەم موتەقییان
پیت لێدان: ئالاء محەمەد
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر - ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (١١٤٧)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

# نامۆبوون لە شیعرەکانی -نالی-دا

لە ڕوونکردنەوە و بەرچاوخستنی کاری نامۆبوون لە شیعرەکانی نالی-دا پێویستمان بەوە هەیە پێش دەستبردن بۆ نالی و شیعرەکانی سەبارەت بەنامۆبوون و نامۆیی لە مانای نامۆیی و نامۆبوون بگەین و بزانین ئەم واتایە چییە و چی دەبەخشێ! وە ئایا ئەمە شتێکی فەلسەفی و کۆمەڵێ زانیاری وشکی ناو کتێبە یاخود لەو سنوورەی تێپەڕاندووە و لە ژیانی مرۆڤدا لە کۆن و ئێستادا بوونی هەیە و بەئاسانی دەستنیشان دەکرێت؟ واتە یەکێکە لەو ناوەڕۆك و ڕواڵەتانەی کە پەیوەندیدارە بەژیانی ڕۆژانەوە و ئێمە ئەگەر لایەنە باشەکانی ئەم دیاردەیە بخەینە بەرچاو ئەوا دەتوانین لە شیکردنەوەی یەکێ لە گیروگرفتەکانی مرۆڤی ئەم ڕۆژگارە ئاگاداربین.

نامۆیی چییە؟: -نامۆیی واتە- (گواستنەوەی تەواوی مافەکانی ژیانی کەسێ بۆ کەسێ یاخود جێگایەکی تر)[1] باسکردن و ڕوونکردنەوەی هەموو ئەو ڕایانەی کە دەچنەوە سەر لێکدانەوەی نامۆیی کە بابەتێکی ئەوەندە چڕ و لق و پۆدارمان بۆ پێك دەهێنێت کە تیایدا ون دەبین، ئەوەش بتوانین لێرەدا بەکورتی دەری بڕین ئەوەیە کە (نامۆیی واتە لە دەستچوونی دەسەلات و گۆشەگیری و تورەیی و ڕق هەستان و پچڕان و تێکشکان لە واقیعی ژیان)[2]. زانا و ئەدیبە گەورەکانی جیهان وەك -توماس هوبز -ڕۆسۆ -فیختە -شیللەر -هیگل . باسیان کردووە وە کورتە و پوختەی بیری زانایان لەسەر نامۆیی بریتییە لە شەش بەش کە ناوەڕۆکی ئەم واتایە دروست دەکەن.

١- نامۆیی وەك جیابوونەوە و لە یەك دابڕان.

٢- نامۆیی بە واتای جێگۆڕکێ.

٣- بە واتای بابەت -الموضوع-.

٤-بە واتای نەبوون و بڕانی توانا و دەسەلات.

٥- نەبوون و بڕانی ناوەڕۆك.

٦- نامۆبوون بەمانای کەرتبوون و پەرتبوونی پێوەر و چۆنیەتی پێوەرەکان.

واتە -المعایير والمقاییس-.

دیسان هەر لەم سەرچاوە فراوانەدا دەربارەی نامۆیی، ئەم بەشانە و ئەم گرووپانە

هەریەك بەتایبەت بەڕوونكردنەوەی خۆی دانراوە

١- نامۆیی لە خۆ.

٢- نامۆیی لە كۆمەڵ -نامۆیی بابەتی-

٣- نامۆیی لە ئیسلامدا.

٤- نامۆیی ئاینی لای فیورباخ.

٥- نامۆیی و هەستی گەردوونی.

وە وشەی نامۆیی بابەتەكانی دیسانەوە لای ئەم هونەرمەند و زانا و ئەدیبانە باس كراوە:

١- ئیفلاتوون بەپێی نامۆبوون لە كتێبی -كۆمار-مكەیدا.

٢- هیگل.

٣- بیتهۆڤن.

٤- ڤان كۆخ.

٥- شكسپیر لە هاملت-دا.

٦- لە ئادابی لاهوتیدا.

٧- لای -البیر كامۆ-.

٨- لای جان جاك روسو.

٩- لای هیدجرو سارتەر.

١٠- لای فروید.

١١- لای ماركس لە جیاوازی چینایەتیدا.

لێرەدا دێینە سەر بابەتی سەرەكی خۆمان و دوو لایەنی زانستییانەی نامۆیی سەبارەت بەدەركەوتن و ئاشكرایی لە شیعرەكانی نالی-دا باس دەكەین ئەویش ئەم دوو لایەنەیە:-

١- نامۆیی خۆیی -تاكە كەسی- زاتی-الشخصي.

٢- نامۆیی بابەتی -الموضوعي.

١- نامۆیی خۆیی - تاكە كەسی.

نالی دەڵێت:

«عومرێکە بەمیزانی ئەدەب توحفە فرۆشم

زۆرم وت و کەس و تێنەگەیی نێستە خەمۆشم»

«هەرچەندە کە عومری خضر و جامی جەمت بوو

چونکە ئەمەلت زۆرە چ عومرێکی کەمت بوو»

«نالی خۆشت ئەومیدی دڵ بەستە مەبە ئیدی

گەر عاشقی تەجریدی لەم یار و دیارەت چی»

لە بارەی بوونی هەستی کۆمەلایەتی و ڕێڕەوی تاقیکردنەوەکانی کۆمەڵ لەو بوارەدا بەچەشنێك بووە کە بۆشایی گەورە کەوتووەتە نێوان ئەو بابەتانەی پوختەی هەست و دەرك پێکردنی کەسێتی نالییە.

بۆشاییەکە تەرازوویەکی یەکسان نەبووە، لاسەنگ بووە، تای یەکەمی لە بەرزی بیرکردنەوەی نالی-دا واتای دووەمی لە نزمی ڕادەی پێشکەوتنی بیر و هۆشیاری کۆمەلایەتی کۆمەڵ بووە.

ئەم -بەمیزانی ئەدەب و توحفە فرۆش بووە- ئەوانیش تێی نەگەیشتوون ئەم -رد الفعل-ە ئەنجامەکەی خامۆشی خاوەنەکەی بووە کە -نالی- دەگرێتەوە.

لە بەیتی دووەمدا هەستی گەردوونی -الوعي الكوني- دەبینە -عومری خضر و جامی جەم- کە دوو دیاردەی گەورە و نەبڕاوەن. زیاترن لە توانا و دەسەلاتی مرۆڤ بۆ ژیان و دەرك پێکردن.

ئەمە لایەنی یەکەمی موعادەلەکەیە - لەو بەریشەوە -نالی هیوای زۆر گەش و عومری کەم و کەمتر لە کەسێکی وەك ئەم و بەلام- جیاواز لە هەست و بیر و عاتیفە.

کە ئەمانەش هەمووی ڕووی دا...

١- زۆرت داهێنا و کەس لێی نەپرسی.

٢- عومری خضر و جامی جەمیشت بوو کەچی تەمەنت کورت و بێ بەها بوو.

کە ئەم دوو لقمان دەرهێنا ئەوا دەبێتەوە ناوەرۆکی سێیەم بەیت کە ئەنجامەکانی دەبنە یەك و دەبێ نالی دڵ بەستە و بێ بەستە بێ دەبێ ڕێگەی دوورە ولاتی سەری خۆ هەڵگرتن هەڵبگرێت و هەرەشەی سۆفییەکان و بێ پشت و پەنایی ئەمیش بە ئەمانی

میرنشینی بابان زیاتر جۆشیان دایە و ڕێگەیان پێ گرتە بەر.

کەواتە نامۆیی خۆیی نالی -نامۆیی خۆ نەناسین و ونبوون و ڕەشبینی نییە چونکە ئەو جۆرە نامۆیی و ونبوون و ڕەشبینییە لای زۆر ئەدیبان و زانایانی لای خۆمان و هەندەران دەست دەکەون و فەلسەفەش هەر لە -کۆمار-مکەی ئیفلاتوونەوە هێمای بۆ ئەمە کردووە.

لای نالی- کپبوون و سەری خۆ هەڵگرتن و دەرکردنی جیابوونەوە لە خۆی نەبووە لە هیچ بەیتێکیدا ڕاڕابێ و گومانی ئەم ڕۆیشتن و سەفەرە نا بهێنرێت. لەوەشدا کە -محەمەدی مەلا کەریم- لە کتێبی -نالی لە کلاو ڕۆژنەی شیعرەکانییەوە- دەڵێت: «نالی دوو سەفەری حیجازی هەیە و مادەم لە کاتی سەفەری یەکەمیاندا بەگوڕ کامی لێهاتوو بووە لە سەفەری دووەمیاندا پیر و ئوفتادە و لێ کەوتوویووە دیارە ئەگەینە ئەو ئەنجامە کەوا ئەبێ هیچ نەبێ(١٥) ساڵێك لە نێوان ئەم دوو سەفەرەیدا بوویێ»(٣). واتا نالی دووجار چووەتە حەج. دیارە کە سەفەری یەکەم لە سلێمانییەوە دەستی پێ کردووە سەفەری دووەم لە ئەستەمولەوە پێویستە ئەوەش بڵێین کە لە باسی -نامۆیی لە ئیسلام-دا لە یەکێك لەو خاڵانەدا کە هاتووە وا دەگەیەنێت کە زیارەتی ماڵی خوا خۆ ناسین و خۆ دۆزینەوەی ئەم مرۆڤەیە سەبارەت بەوەی کە بیروباوەڕی ئاینی و (یەقینی نەفس) خۆی پاڵی پێوە دەنێ کە ماندوویەتی دوورە وڵاتی بچێژێت. بۆ ئەنجام گەیاندنی یەکێك لە کۆڵەکەکانی بوونە موسوڵمانی تەواو کە ئەویش -حەج-ە نالی کە دووجار ئەم کارەی کردبێ گومانی تیا نەماوە کە هەموو پارچەیەك لە دڵ و بیر و لەشی خۆ ناسین و خۆ ساخکردنەوەی تەواو بووە. لێرەدا دەڵێین نامۆییەکە تەنها نامۆیی جێگەیی بووە.

-الغربة المكانية- بووە بەجێگۆڕکێ و بچڕانی لە جێگەیەك لە بەشێکی زۆری تەمەنی تێدا بەسەربردووە و جۆرەها یادگار و بیرەوەری شیرین و تاڵی تێدا هەیە و لە یادیا کاڵ نابنەوە.

تا لەو کاتەشدا و لە قەسیدەیەکدا کە بۆ وەسفی ڕێگای حەج و بەهای گۆڕ و جێگەی -محەمەد- تەرخانە ئەوا تەواو تێکەڵ بەیەقینی خۆی دەبێ و -حەبیبەی ماڵیاوا- و -شێوەی حوجرەی کۆن- هیچی تر لە ژیانیدا دەوری کاریگەریان نابێ و نالی وەسفی حەج و شاعیریەتی ئەبنە سێ لقی دارێك کە جیهانی نالییە.

لەو جۆرە ساتانەدا نالی نە نامۆیە و نە هەستێکی نامۆبوونیش دەردەبڕێ ئەگەر لەم جێگەیەدا بوەستین و بگەڕێینەوە سەر نالی دەبینین لە کات و جێگەیەکی تردا دەگەڕێتەوە نامۆیی سەفەری خۆی بەخراپ زانیوە -ئەو-ی لە حەسرەت قەدی سەرووی حەبیبە فرمێسکی لە جۆگەی تێپەڕاندووە و بووەتە ڕوویار. لە سەرەتاوە دەڵێت:

ئەمردم من ئــەگەر ئەم جارە بێ تۆ
ئەچم شەرتە هەتا ئەم خوارە بێ تۆ

هەتا

«لە حەسرەت سەروی قەددت چاوی نالی
دوو جۆگە بەڵکـو دوو ڕووبــارە بێ تۆ»

-لەم بارەیەوە- ئەلبیر کامۆ-ی ئەدیب و فەیلەسووف دەڵێت: «دڵدارەکان ئەگەر لە یەکتری دابڕان لە ئازاردا دەژین. بەڵام ئەمە هیوا بڕاوی نییە ئەمان ئەزانن کە خۆشەویستی هەیە. هۆی ئەمەیە کە من ئازار دەکێشم چاوەکانم وشکن. لە دوورە وڵاتی چاوەڕوانم. ئەو ڕۆژە هەر دێت کە بەتەمایم»[٤] ئەم باوەڕەیەی کامۆ و قەناعەتی بڕیاردانی سەفەر لای نالی دوور نین لە یەکەوە چونکە نامۆییە جێگەییەکە -واتە غوربەتە مەکانیەکە- پاش دابڕان لە حەبیبە و ناز و لانەی گەرمی بابانەکان لای شاعیر بووەتە شیعری جوان و وردەکاری بیر و وشە بەکارهێنان. ئەو جۆرە شیعرانەی کە شاعیرێکی بلیمەتی وەك پیرەمێردیان هەژاند کە بڕیار بدات و بڵێت: «ئەگەر لە شیعردا ئیبداع شەرتێکی ئەعزەم بێت، بێ گومان نالی گەورەترین شاعیری کوردە»[٥].

ئێمە لە سەرەتای ئەم نووسینەدا لە خاڵی یەکەمی نامۆیی دواین کە نامۆیی خۆیی -زاتی-یە. دەبێ ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە نامۆیی جێگەیی بووەتە هەوێنی نامۆیی -بابەتی-الغربة الموضوعية- واتە کارگەری هۆشمەندی و بیرتیژی لەوێدا لای نالی دەرکەوتووە سامانی ڕۆشنبیریشی زیاتر یارمەتی ئەوەی داوە کارەساتە ناخۆشەکان لە کەسێتی خۆی دوور نەخستۆتەوە و شیعری خۆی وتووە، گریانی خۆی هەر گریاوە. دواجار کە ئارەزووی گەڕانەوە بۆ نیشتمان لەسەری دەدات نامە شیعرییەکەی بۆ سالم دەنێرێت وە سالم وەڵامی دەداتەوە کە نەگەڕێتەوە وڵاتی سلێمانی بێ خاوەنە.

ئەو کاتە ئیتر دەست لەو هیوایە هەڵگرێت کەچی ئەمجارە نامۆییە جێگەییە خۆییەکەی لای نالی نابێتە یەکێك لە پێناسەکانی نامۆیی. کە بچڕان لە مەزووع و

ونبوونە لە ناخی خۆی و کەرتبوونی بیر و هۆش و هەستە.

نالی نەیزانی خەمەکەی، خەمە هەرە قورسەکانی ئەوەیە کە دەربەدەر، بێ ڕووناکی چاوی حەبیبە، بێ بەها و شکۆی دەسەلاتی باہان، بێ داری قەرەداغ و سلێمانی مالئاوایی لە ژیان دەکات، بەلام ئەمە لە شیعر و ژیانی دوور نەخستەوە. وە لەم دوو بەیتەدا تەواو ئەمە دیارە:

«مورادم زیللەت و پارانەوەی حالە ئەوەك ئەعتە

بەچەند بەیتێکی کوردانە کە قورئانت ئەناخوانە

ئەگەرچی کوردی دەوری شارەزووری قەسومتم ئەمما

وەسیلەم طیبە و حیلمی شەفیع و فەزلی مەننانە»

کەواتە ناموێی خۆیی نالی هیچ ترسێکی دابڕانی داهێنان و گۆشەگیری و خەلوەتکێشی بۆ دروست نەکردووە نە بووەتە مەترسی لە ڕێگای ڕێڕەوی شاعیریەتی ئەودا.

٢- ناموێی بابەتی: -الغربة الموضوعية-

«ناموێی بابەتی بریتییە لە هەستی مرۆڤ بۆ کەسانی تر کە وەك خۆی نین. وەچاو پۆشینی لەو پەیوەندیەیانەی کە پێکیانەوە دەبەستێ. دەبێتە هۆی دابڕان بەهۆی مەبەستێکی سەرەکی کەسی ناموە و زۆرجاریش ئەم ناموێییە دەبێتە هۆی گۆشەگیری و تەنهایی بەبێ ئەوەی ببێتە ئالۆزی بیر و تێکشکاندن» لەم پێناسە زانستییەوە ئەگەر تەماشای دنیای ناموێی و کاری ناموبوونەکە بکەین دەبینین نالی لە دوو لایەنەوە لەم ناموێییە بابەتییە جیایە. یەکەم چاو نەپۆشینی کە چەندێتی و چۆنیەتی ئەو پەیوەندییە مرۆڤایەتییانەی کە بەکەسانی دەورپشتی خۆیی و بەولاتە دوورەکەیەوە بەستووە.

دووەمیش ئەوەیە کە ناموێییە بابەتییەکەی نالی نە گۆشەگیری بووە و نە ئالۆزی بیر و تێکشکاندن بوو. وەك دەلێت:

«ئەوعە ئینسانێ هەیە غەم قووتیە

من خەمی خۆم و خەمی هەموو عالەم دەخۆم»

یاخود

«طوطی تۆ لە حیرصی دڵ داوی طەمەع دەکاتە مل

بولبولی من لە عەشقی گوڵ تەغنیەو موطەرەب دەکا»

وە لە زۆر بەیتی تریشدا ڕەگەزی کۆمەڵایەتی تێکەڵ بەشیعری دەبێ و لەگەڵ نامۆییدا دەبنەیەك. وە ئەویان هیچ کارێکی سلبی ناکاتە سەر ئەمیان و لەسەر ئەو نازێ. کەواتە نالی بۆ نامۆیی نەژیاوە و لە پێناوی نامۆییدا بەڵکو نامۆیی کردووە بەشانەمارێکی خوێنبەر بۆ دڵی شیعرەکانی زیاتر ئەمە لە هەستی کۆمەڵایەتی نزیك خستووەتەوە.

لە شیعرەکانیدا بەهۆی ئەم وشانەوە نامۆییە بابەتییەکەی خۆی دەرخستووە. (غائیب، هیجر، غەریب، دەرکراو، دەربەدەر، غوربەت، دووری، هیجران). بەم وشانە بیری فەلسەفی نالی لە نامۆبووندا دەبێتە ئەوەی بڵێین (نامۆیی بابەتی بووەتە نزیك خستنەوەی ئەو نامۆییە خۆییەی کە باسمان کرد. واتە (زات و مەوزووع) بوون بەیەك. کە یەکێتی زات و مەوزوع پێکهات دەبێت بزانین کە چۆنەتی ئەو زات و مەوزوعە هەر لە داهێنان و بۆچوونێکی شاعیردا چەندە بەلای –واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە ڕۆیشتووە لە خزمەتی سامان و کەلەپووری ڕۆشنبیریدا بووە بەرەو کۆمەڵ.

لە بەشی پێشوودا نامۆیی خۆیی–مان ڕوون کردەوە کە مەترسی ونبوونی لەسەر نالی دروست نەکردووە. وە کاتێ کە ئەم زاتە چووە مەوزووعی شیعرەکانییەوە جگە لەوەی کە لە واقیعێکی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە و هەواڵی ژیان و عەشقی خۆی و کەسانی تریش زیاتر ناگەینە ئەوەی کە نامۆیی بابەتی بە مانا فەلسەفییەکەی لای نالی بدۆزینەوە. ئەگەرچی خۆی لەو ڕۆژگارەدا هەستی بەتەرکیبی نامۆبوون و مانای فەلسەفی نەکردووە ئەمەی تەنها وەك هەستی شاعیرانەی کردووە بەهابەت ئەوەك وەك و مەبەستێکی فەلسەفییانە و دەرگا کردنەوەی بەئەنقەست بۆ تێکەڵبوونی ئەم تەوژمە بەشیعرەکانی. وە بگرە خۆشی زۆری ویستووە کە نامۆ نەبێت بەخەمی نامۆیی دوورە وڵاتییەوە سەر نەنێتەوە. نالی دەڵێت:

«مەمخەرە هاویەیی هەولی فیراق
دەستی من و دامانی تۆ ڕۆژی قیا»

نالی– لەم فیراقە زۆر ترساوە کەچی تووشی هاتووە. لەو شیعرانەیدا کە لە وڵاتی هەندەران و نامۆبوون نووسیوینی بابەتی نامۆیی خۆی لە خۆیدا بەرنامەیەك نەبووە مەبەستی بووبێ وە کاتێك وەهای دانابێ کە ئەو بەرنامەیەی تیایدا کۆتایی بێت وە ئیتر لەو جۆرە شیعرانە نەڵێت. بەڵکو نامۆییە بابەتییەکە خۆی بووەتە بابەتی شاعیریەتی ئەو وە داهێنانی پێ بەخشیوە. وە هەتا ئەو جێگەیەی کە بتوانرێ هێما بۆ سایکۆلۆژییەت

و بیرکردنەوەی نالی بکرێت هەر کاری نامۆیی و دووره وڵاتی لە شیعرەکانیدا دەبنە هەوێن و بەردی بناغەی. ئێستا نازانرێ ئاخۆ نالی دیوانی تری هەبووە یان نا؟ وە شیعرەکانی ئەو دیوانەی کە گوایە لە وڵاتی نامۆییدا وتوونی بابەت و شێوەیان ئاخۆ چۆن بوویی؟ ئایا تەواو لەناوچووە یاخود نەدۆزراوەتەوە بەڵام ئەوەی لە بەردەستماندایە وە لێی دڵنیاین کە بەئاسانی شیعری وڵاتی خۆی و شیعرەکانی دووره وڵاتی جودا دەکرێنەوە تام و بۆ و نیشانەیان دیارە.

ئەمە زیاتر ڕێگا خۆش دەکات بۆ لێکۆڵینەوەمان. بەڵام ئەوی جێی داخە ئەوەیە کە نالی بۆ گرێیەکی هێشتووەتەوە لەوەدا کە دەستی لەسەر ئەو ناکۆکی و دژایەتیانە دانەناوە کە بوونەتە ناوەڕۆکی بیرکردنەوەی ڕوو کردنە وڵاتی نامۆیی. جگە لە ئاستی شاعیریەتی ئەمدا وەك پێویست تەمەشایان نەکردووە.

بەڵام لە بابەتی نامۆییدا- و بەپێی ڕوونکردنەوەی فەلسەفییانەی ئەم دیاردەیە ئەتوانین بڵێین:

١- نالی لە بارێکی دەروونی شاعیرانەدا بووە.

٢- ڕادەی ڕۆشنبیری کە لە زۆر شیعردا دیارە فراوان و بەهێز بووە.

٣- لە مەسەلەی دڵدارەکەی و خۆشەویستی حەبیبەشدا تووشی -تێکشکان- بووە.

٤- دەسەڵاتی بابان نەماوە و مەترسی بۆ دروستبووە.

٥- بیروباوەڕی مەلایانە و شاعیرانەی ژیری ئەم لەگەڵ سۆفییەکاندا جیاواز بووە.

بەم شێوەیە هەستی بەڕێگرتنەبەر و چوون بۆ حەج و نەگەڕانەوە لای نالی بووەتە بابەتێکی تایبەت و قەناعەتی کردووە بەڕۆیشتن و کارەکەی یەکلایی کردووەتەوە. هەر لە یەکەم شیعری نامۆییەوە هەردوو بابەتەکەی نامۆیی لە زات و مەوزووعدا بوونەتە لایەنی کۆمەڵایەتی و بەواقیعی دانی ڕێبازی شیعری نامۆیی نالی ئینجا ئەتوانین بڵێین کە نالی:-

١- لە وڵاتی خۆیدا نامۆبووە و لەو شیعرانەیدا هەست بەم دیاردەیە ناکەین.

٢- ژیانی ناو حوجرەکەی دووری لە کۆمەڵانی خەڵك بەگشتی و گۆشەگیری و تاك پەرستی نەبووە. بەڵکو بەحوکمی کارەکەی وەك مەلایەك و بەپێی نەریتی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە ڕەوا نەبووە ئەوەی هەر کەسێك دەیکات مەلایەکی ناسراویش بیکات. بەتایبەتی مەلا کەسێك بووە قورسی ڕووداوەکان زیاتر لە سەری دەکەوتن لە کۆمەڵیشدا

بوونی شاراوە نەبووە و بەبەر چاوانەوە دیار بووە. لەبەرئەوە لە زۆر شت سڵەمیوەتەوە و دەستی بۆ نەبردووە. ئینجا کە نالی لە وڵاتی خۆیدا نامۆ نەبووبێ و هەستی دووری و نامۆیی لە جێگایەکی تر جیاواز لە وڵاتی خۆی دەرکەوتبێ ئەوا نامۆییەکەی پێی دەوترێ نامۆیی جێگەیی و لە نەفس و زاتەوە دوورە.

٣- ڕۆشنبیری فراوانی نالی و ڕەنگدانەوەی ئەم ڕۆشنبیرییە لە هەموو بەیتەکانیدا نەبووە هۆی نامۆبوون بۆی.

وە نالی سەرڕای ئەوەی کە مەلایەکی شارەزا و خوێندەوارێکی باش بووە خاوەنی سامانێکی بەرزی ڕۆشنبیری بووە کە هەموو کەس لەو ڕۆژگارەدا دەستی نەدەکەوت.

وە خۆشەویستی ئەو لە لایەن دەسەڵاتی میرنشینی بابانەوە زیاتر ئەو ڕایە جێگر دەکات چونکە لە یەکێ لە لێکدانەوە فەلسەفییەکانی مانای نامۆبووندا وا باس کراوە کە مرۆڤ کاتێ هەست دەکات خاوەنی سامانێکی ڕۆشنبیری و بەهرەیەکی بلیمەتانەیە و خەڵکی تر لە ڕادەیدا نین بۆ تێگەیشتن لەو شتانەی کە ئەم تێیاندەگا و بۆشایی و جیاوازی هەیە لە نێوان ئەم و خەڵکدا و بلیمەتییەکەی دەیکاتە خاوەنی ئەو ڕەفتار و کردەوانەی کە ڕەنگە لە کۆمەڵدا شاز بێت و ئەمیش ناتوانێت وەك ئەوان بێت و تێکەڵیان بێت. لەبەرئەوە هەست بە بەرزبوونەوەیەك دەکات و ئەمیش تووشی گۆشەگیریی تاك پەرستی و ڕەشبینی دەکات بەرامبەر بەکۆمەڵ. بەڵام نالی بەم جۆرە نەبووە و سامانە ڕۆشنبیرییەکەی هانی داوە زیاتر لە خەڵك بکات و بتوانێ لە چین و کۆمەڵانی جۆراوجۆری کۆمەڵ بگات.

وە هیوایەکی گەورەی عاتیفی سەبارەت بەحەبیبە و دواڕۆژ و چارەنووسی خۆی و حەبیبە و پێگەیشتنی لە لایەکی تریشەوە ڕێز لێ گیراو و پەسەندکراوی پاشاکانی میرنشینی بابان بووە و لە دیوەخانی ئەواندا شیعری خۆی خوێندووەتەوە.

وە ئەنجام سەفەری غوربەتی هەڵبژاردووە و هۆی ئەمەش سێ حاڵە:

١- هیوای بڕاوی لە بەدەستهێنانی حەبیبە.

٢-ڕووخاندنی میرنشینی بابان و هاتنی تورك.

٣- دووژمن کاری سۆفییەکان و پیلان نانەوەیان بۆ نالی.

وەنالی خۆیی و شیعرەکەی لەو سەفەردا جویێ نەکردۆتەوە و باسی ئەوەی کردووە کە چۆن (شیعرەکانی کە جگەرگۆشەی ئەون وەك خۆی دەربەدەرن).

٤- بۆ تێگەشتنی تەواو لە نامۆبوونی نالی -بوونی قەناعەت و فرێدانی ڕاڕایی و دوودڵی و دڵ لە دوویییە. ئەمەش زۆر زیاتر لە مانای فەلسەفی و نامۆیی دوور دەکەوێتەوە. نالی شاعیرێکی ڕاڕا نەبووە. واتە -قلق- نەبووە. هەر شیعرێ کە نووسیویە. وە هەر وڵاتێ کە ڕووی تێ کردووە کە گومان لە بڕیاری خۆی بکات و دوودڵ بێت لە قەسیدەیەکی و بۆ مەبەستێکی تایبەتیش نەچۆتە غەریبی و بەهیوای ڕۆژی گەڕانەوەش سەفەری نەکردووە.

کەواتە نالی لە خۆی نامۆ نەبووە لە خەڵکی نامۆ نەبووە لە شیعر و داهێنان نامۆ نەبووە. بەڵکو هەستی نامۆیی ئەو لە گۆڕانی باری ژیانی خۆی و دەوروپشتییەوە سەری هەڵداوە و واتای -نامۆیی جێگەیی بەسەردا دەچەسپێنێ.

وە لەمەشدا هەست بەبیرەوەری یادگارەکانی وڵاتی خۆی لە کاتە دێرینەکاندا جۆرێکی کەی نامۆیی بۆ پێکهێناوە کە پێی دەوترێت نامۆیی کات.

**ئەو سەرچاوانەی بۆ ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیە سوودیان لێ وەرگیراوە ئەمانەن:-**


١- كتيبي (الاغتراب) -: التاليف: يتشارد شاخت، ترجمة: كامل يوسف حسين - الطبعة الاولى ١٩٨٠، ص٦٣.

٢- الاغتراب -اصطلاحات و مفهوما- قيس نوري من مجلة الافكار- عدد خاص عن الاغتراب، ص١٣.

٣- نالی لە کڵاو ڕۆژنەی شیعرەکانییەوە -محەمەد مەلا کەریم- ل٣٨.

٤- البير كامو -جرمين بري- دراسة عن كامو ترجمة: جبرا ابراهيم جبرا -١٩٨٦

٥- خدمەتێکی بێ هەمتا بەموناسەبەتی تەبعی دیوانی نالییەوە ڕۆژنامەی ژیان ٢٩٣، ١٤ئەیلوولی ١٩٣١،(پیرەمێرد)

٦- ئەو بەیتانەی نالی- کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا نووسراونەتەوە لە کتێبی -دیوانی- نالییەوە وەرگیراون ئامادەکردن و کۆکردنەوەی مەلا عەبدولکەریم مدرس و فاتح عەبدولکەریم لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردە.

# بەشی دووەم

لە کتێبی دیوانی نالی دا کە بەباشترین و بەنرختترین سەرچاوە دادەنرێت بۆ تەماشاکردن و وردبوونەوە لە شیعری نالی لە پێشەکی شیعرەکاندا گەلێك هەوڵدان و لێکۆڵینەوە ئەنجام دراوە و نووسراوە و یەکێك لەوانە بەناوی ئەدەبی بێگانەیە، لەوێدا ئەگەرچی ئەبوایە زیاتر نووسینەوەکە پەرەی پێ بدرایە و قووڵتر بۆ ڕۆشنبیری نالی بچوایە، بەلام لە ڕاستیدا دادەنرێت بەدەرگایەك بۆ چوونە ناو جیهانێکی نوێوە لە شیعریی – نالی –دا وە بۆ زۆری وەك من ڕووناکاییەکی سەرەتاییە کە گەلێ لایەن و قوژبنی تاریك ڕۆشن دەکاتەوە لە بنی دەریای شیعری نالی دا دەکەوینە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ئەو گەوهەر و مرواریانەی تەنها نالی توانیویەتی بیخوڵقێنێ و ئەخشکاری دەستی وەستایەتی خۆی تیادا بنوێنێ ڕۆشنبیری نالی لە قەوڵبوونەوەی شیعرەکانیدا دەردەکەوێت و ئێمە پشت بەشیعرەکانی بەم چەند خاڵە دەستنیشان دەکەین:

١– زانستی ئەستێرەناسی، واتە فەلسەفەی زانستی (فەلەك)

٢– زانستی بەلاغەتی زمانی عەرەبی بەهەموو لقەکان و بەشە سەرەکی و لاوەکییەکانیەوە

٣– شارەزایی لە مێژووی کۆنی سەردەمەکانی مێژووی کورد و مێژووی کۆنی ئاینی ئیسلام.

٤– ئاگاداربوون لە زانستی جوگرافیا و بەکارهێنانی ئەو واتایانەی کە سەر بە ئەم زانستەن.

٥– ئاگاداربوون و زانینی زانستی فیزیا.

٦– شارەزایی لە ئاواز و جۆری مەقامات کاتێ باسی مەقامەکانی حیجاز و مخالیف و نەوا دەکات.

٧– سوارچاکی لە مەیدانی بەکارهێنانی وشەی کوردی و وردەکاری لە هۆنینەوە و ڕێکخستنی شیعردا.

٨– تێکەڵبوون لەگەڵ ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی شام و تورکیا، وە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی لە کۆمەڵی تازە پێگەیشتووی ئەو سەردەمەی تورکیا بەهۆی دەسەلاتی

دەوڵەتی عوسمانی و پەیوەندی نزیکی تورکیا و ئەورووپا دیارە کە ئەمە هەتا چ رادەیەك دەوڵەمەندیان کردووە بەسامانی رۆشنبیری.

٩- رۆشنبیری فراوانی خۆی لەوەی هەر لە سەرەدەمی فەقێیەتییەوە و ئەوەی لە حوجرەدا و لای مەلا بەناوبانگەکانی ئەو کاتە فێربووە بێ گومان ئەم هەر بەو رۆشنبیرییە تەقلیدییەوە نەوەستاوە هەوڵی تاکە کەسی خۆی لە زۆر مەلای تێهەڕاندووە لە بواری بەلاغەتی زمانی عەرەبی و شەرع و زانستی - کەلام - نوسولی دین و...هتد.

١٠- شارەزایی تەواوی لە نهێنییەکانی زمان و ئەدەبی کوردی و فارسی و تورکی.

ئەمە جگە لەو زیرەکی و بلیمەتییە خۆڕسك و سروشتییەی خۆی لە خۆیدا لە وجودی - نالی -دا خولقابوو. وە رۆژ بەرۆژ پەرەی دەسەند.

ئینجا ئەم دە خاڵەی سەبارەت بەرۆشنبیریی نالی دەستنیشانمان کرد ڕاستی ئەم زانیارییە نوێیەمان بۆ ساغ دەکاتەوە کە لەم دواییەدا نووسەر - هۆشەنگ - لە رۆژنامەی - هاوکاری -دا بەرچاوی خستین. بەشێك لەم نووسینە بەم جۆرەیە «کاتێ لە ئەستەموڵ زانرا - نالی - مردووە کوردەکان و ناسیاو و برادەرانی پێوە چوون لە چاوەڕوانی شتنی و کەفن کردنیا بەبن درەختەکانی باخی ماڵەکەیا بڵاوبوونەوە لەپڕ بەکڵپەی ئاگرێکیان زانی لەو لای حەوشەکەوە بەرز ئەبووەوە ژنەکەی نالی بەدیارییەوە ئاگرەکەی خۆش ئەکا، بەدەم هەنسکی گریانەوە پەڕاو و پەڕە کاغەز ئەسووتێنێ.

کاتێ چوون بەلایەوە ئەیوت - لە پاش ئەفەندی کەسی تر لایقی خوێندنەوەی ئەمانە نییە بۆیە ئەیان سووتێنم و چاویشم بەرایی نایە بیانبینم. گوایە ئەوە هەموو بەرهەمەکانی نالی بووە کە بەلای خۆیەوە ماوە هەتا بەوە ئەزانن کار لە کار ترازاوە و بەسووتان کەڵکی لێ بڕیون هەر ئەو کۆزە گێڕایانەوە لە ناو ئەو سووتاوانەدا پەڕاوێکی - ڕیازیات -ی هەرە بەرز و پەڕاوێکی - فیزیا -ی هەرە قووڵ هەردووکیان بەکوردی بوون لەگەڵ هەڵبەستەکانیدا وەك دواتر پێیان زانیوە. چونکە هەتا هێزی تیا بووە لە دانیشتنەکەی ئەستەموڵدا مامۆستای ئەدەب - و - ڕیازیات - و فیزیا - بووە و باشتر بەمانگانەی خانەنشینی ژیاوە. هەر لەو دانیشتنەماندا لەوانەم بیست کە نالی بەهۆی فیزیا زانی خۆیەوە دوو شتی لە خانووەکەی خۆیدا دروست کردووە لە ئەستەموڵ. یەکەم بەئەوەی دەست لە دەرگا و پەنجەرەکانی خانووەکەی کەوتبێ هێزێکی کارەبایی لێداوە و (دووەم)، ژوورێکی خانووەکەی لە ناوەوە زستانان چینکۆ پۆش کردووە و بەهۆی

زانستی فیزیاوە ئەو چینکۆیە گەرم بووە و ژوورەکەی گەرم کردوونەتەوە و پێویستی بەشاگر تێ بردن نەبووە کەواتە زانیاری و زانستی ناو شیعرەکانی نالی ڕاستی ئەم نووسینەمان بۆ دیاری دەکات. بەڵام بەداخەوە ئێمە جگە لە شیعر تەنها شیعر نەبێت هیچ نووسین و کتێب و یاداشتی ئەم مرۆڤە زانا و گەورەیەمان لە لا نییە هەتا زیاتر ئاسۆی تەماویمان ڕۆشن بکردایەوە و باشتر بەڵگەی بلیمەتی و زانایی شاعیریی نالیمان لە دەست خۆماندا هەڵبگرتایە و تێکەڵ بەجیهانە سیحری و بێ ئەندازە قووڵ و پان و بەرینەکەی بکردایە. ئایا ئێمە لێرەدا ناتوانین لە خۆمان بپرسین و بڵێین ئەو ژنەی نالی کە تورك بووە و زانا و شاعیرێکی هەست ناسکی وەك نالی ژیانی لەگەڵ بەسەر بردووە ئایا ئەو بەرهەمە زانستییانەی نالی بۆ سووتاندووە؟ لە وەڵامدا دەڵێم: «ئەو ژنەی نالی تورك بووە هیچ بەڵگە و ساخکردنەوەیەکمان لە لا نییە کورد بووبێ یاخود حەبیبەی مـاڵـهـاوایی بووبێ وە من بۆچوونی – پیرەمێردی ئەمر– پەسەند دەکەم دەڵێت: «لە ئەزەرەدا حەبیبەی ماڵیاواش شەخسێتێکی حەقیقی نەبووە و تەنها ڕەمزێکە حەزرەتی نالی کردوویە بەواسیتەی ئیزهاری دەعای شاعیرانەی»(٢)

لە پاش ئەمانە نالی بەهەموو پێشبینی و وریایی و زیرەکییەکەی خۆیەوە ئایا پێشبینی ئەوەی نەکردووە کە ئەو بەرهەمە زانستیانەی هەروەك شیعرەکانی دەبنە سامانێکی بێ هەمتا بۆ سامانی کەم دەستی زانستی نەتەوەکەی و سووربوون لەسەر وەسیەت کردن بۆ ژنەکەی کە بیان پارێزێ و نەیانفەوتێنێ؟! ئەوا گریمان لەو ژنەش دڵنیا نەبووە و هەستی بەجۆرە بیرێکی خراپکاری ئەو کردبێ دەرهەق بەکورد و زمان و سامانی ڕۆشنبیری کورد. بەڵام ئێمە لەوە دڵنیاین زانای گەورە –مەلا خدر ئەفەندی نالی– مامۆستای دەرسی ئەدەب و ڕیازیات و فیزیای زانکۆی ئەستەمووڵ هاوڕێ و دۆست و خۆشەویستانی کوردی هەبوون دەیتوانی کارێك بکات کە ئێمە ئێستا هەناسەی سارد هەڵنەکێشین بۆ ئەو بەرهەمانە. بەهەرحاڵ ئەم مەسەلەیە خۆی لە خۆیدا کارەسات و زیانێکی گەورە بووە لە سامانی ڕۆشنبیری نەتەوەی کورد. وە لەوەش هیوا براونین کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە لایەکەوە چ ئەم بەرهەمانەی نالی وە بەرهەمی سەرهەڵبداتەوە ڕۆژگار چۆنی لێ ون کردووین ئاوهاش بۆمان بدۆزێتەوە.

لە بەشی یەکەمی ئەم نووسینەشدا ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە دکتۆر مارف خەزنەدار ڕوونی کردووەتەوە سەبارەت بەوەی چەند ڕۆشنبیرێکی کورد پاش کۆچی دوایی نالی دەچنە لای ژنەکەی بۆ بەرهەم و شیعری ئەویش لە وەڵامدا پێیان دەڵێت: «افندی اسار

یوقدر» لە ڕاستیدا ئەم کارەساتە پەیوەندیدارە و بنج بەستە بەبوونی حاڵەتی - نامۆیی - نالی خۆیەوە. خۆی ئەگەر نامۆیی و دووره ولاتی بێ کەسی نەبووبێ لە جێگەیەکدا کە زۆر دوور بووە لە جێ و هەواری دڵخۆشکەری خۆی ئەوا ئەو بەرهەمە ڕەنگە چەند ئەوەندەیەکی دیوانەکەی ئێستای بوایە کە لەبەر دەستماندایە. هەروەها ئەم نامۆییەی نالی لە زۆر لەو ڕووداو و پەیوەندییانەی کە هەیبووە خستوونیەتیە گومان و کورتهێنییەوە زانیاریش دەربارەیان وەك ڕووناکی چرایەکی کز وەهایە. بۆ نموونە پەیوەندی نالی و میرنشینی بابان و ئەحمەد پاشای بابان لە سێ شیعری نالی زیاتر هیچ زانیارییەکمان وە هیچ ڕووداوێکمان ئاگا لێ نییە. ئەو سێ قەسیدەیەش یەکێکیان ئاشکرا و دیارە بۆ کۆچی دوایی سلێمان پاشای بابانی نووسیوە لە کارەساتی کۆچی دوایی ئەودا و هاتنە سەر تەختی ئەحمەد پاشا. وەك لە کتێبەکەیدا ساخ کراوەتەوە ئەو ڕووداوە ساڵی ١٢٥٤ی کۆچی بەرانبەر ساڵی (١٨٣٨ - ١٨٣٩)ی زایینی بووە. ئینجا ئەمە هێشتا ڕوون نییە کە نالی کاتێ ئەو شیعرەی وتووە لە کوردستاندا بووە یاخود لە شام یا ئەستەموڵ. سەرەتای قەسیدەکە ئەمەیە:

تا فەلەك دەوری ئەدا سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو
کەوکەبەی میهری مویارەك تەلعەتی پەیدا نەبوو
تا نەگریا ئاسمان و تەم ولاتی دانەگرت
دڵ چەمەن ئارا نەبوو هەم لێوی خونچە وا نەبوو

قەسیدەکەی دووەم گومانی تێدا نییە کە بۆ دەسەلات و حوکمڕانی و شکۆی سوپای بابان وتوونی. بەلام لەمەشدا بەڵگەمان بەدەستەوە نییە کە ئایا لە ولاتی نامۆیی وتوویەتی یاخود بەپێچەوانەوە؟! سەرەتا قەسیدەکە وەها دەست پێ دەکات:

ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاسەیی شاهن
ئاشوبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن

هەروەها لە نموونەی قەسیدەی سێیەمیشدا تەم و لێلایی لەسەرنەوەیە کە ئایا ئەو قەسیدەیە بۆ کام لە خێزانی حوکمڕانی بابان وتراوە بەلام لە دوا بەیتیدا کە لێی وردبینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە نالی لە ولاتی نامۆیی ئەم شیعرەی نووسیوە. دەڵێت:

مەعلومە لەوێ ڕاز و خوتوری دڵی نالی
إذ حل بقلبی و بأسراره نومی

دیسان لەمەشدا ئەوە ئاشکرا نییە کە ئایا قەسیدەکەی لە کام وڵاتی نامۆیی وتووە، بەڵام لەوەدا گومان نییە کە بۆ کەسێکە لە بنەماڵەی بابان:

ئەی قەلعەی ماهم کە دەڵێی ئەوجی بورروجی
وەی قوللەیی دووری کە دەڵێی قامەتی عوجی
وەك قـــافی زەمیـن قـــابیلی ئیکمال و تەرەقی
وەك بورجی سەمـــا لایقی ئیقبـــال و عورووجی

لە چەند لایەکەوە ئەوە ئاشکرا بووە کە نالی و ئەحمەد پاشای بابان لە ئەستەموڵ هاوڕێی یەکتربوون و ساڵانێکی ژیانیان پێکەوە بەسەر بردووە.

نالی وەك تۆراو و دڵشکاو نامۆیەکی بێ ئاکامی دوا ڕۆژ، گەڕانەوەی ئەحمەد پاشای بابانیش وەك پاشایەکی تەخت و تاج لە دەستچوو باشترین سەرچاوە کە باسی جۆر و کاتی پەیوەندییەکە دەکات دیوانی نالی-یە لە لاپەڕە (٣٠)دا نووسراوە «ئەحمەد پاشای بابان لە - ١٨٥٣ -دا پاریس باسی نالی بۆ - خۆدزکۆ-ی شابەندەبری ڕووسیا کردووە وا ئەگەیەنێ نالی لەو سەردەمەدا لە شام ژیاوە چونکە شیعرەکەشی کە پاش تێکچوونی حوکمی بابانییەکان بۆ سالمی ناردووە بۆ سولەیمانی لە شامەوە ناردوویە. لە لایەکی کەشەوە هەموو ئەوانەی مێژووی ژیانی نالییان خستووەتە سەر کاغەز باسی ئەوەیان کردووە کە وا نالی پاشان چووەتە ئەستەموڵ و لەوێ لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابان ماوەیەکی دووروودرێژ ژیاوە بەم جۆرە باس کراوە وە ئەم ڕووداوانە هەتا ئێستا سەد و سی ساڵی بەسەردا ڕابردووە کە ئەم مێژووە بۆ ئەدیب و زانایانی ئەورووپا ئەوەندە زۆر نییە و هەر ئێستا وێنە و یاداشت و نووسین و دەستخەتی ڕاستەقینەی شکسپیر و تۆلستۆی و دانتی و دوستۆفسکی و زۆری تریش کە دە ئەوەندەی ئەو سەد و بیست ساڵەی بەسەردا ڕابواردووە کەچی وەك ئەوەی دوێنێ بووبێ لە بەردەستایە و هەر یەك لە جێگای تایبەتی خۆی دانراوە و تەنانەت هەندێکیان وەك بودیرو هۆگۆ و چیکۆف خانووەکانیان کراونەتە مۆزەخانە و پێشانگا و لە هەموو لایەکەوە دێنە دیدەنی و تەماشای بەڵام بەهۆیی دواکەوتوویی ئەو سەردەمە تاریکانە و تەبیعەتی شەڕخواز و بەربەری مرۆڤ و درندایەتییەوە ئێمەی کورد بەدبەختانە لەو کەلەپوور و سامانە بەنرخ و بەهادارانەی ڕۆژانێکی تەنانەت زۆر نزیکیشمان بێ بەش بووین و نالی ونبوونی نووسراو و ساڵی مردن و لە دایکبوون و ناوی ژن و جێگا و ڕێگای هەموو بەزوویی کوێربوونەوە و جێگایان نەماوە.

# بەشی سێیەم

پەیوەندیی بابەتی لە نێوان نامۆبوون و کەسێتی نالیدا بووە بە یەکێك لەو لایەنانەی کە زۆرتر لە هەموو لایەنەکانی شیعری نالی هەڵدەگرێت لەسەری بنووسرێت. ئێمە لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا دەتوانین بە مەرامی باسەکەمان بگەین کاتێ پرسیار دەکەین و دەڵێین:

١- ئایا کەسێتی نالی چ گۆڕانکارییەکی تێدا خولقاوە کاتێك لە وڵاتی خۆیدا بووە و کاتێکیش چووەتە شام و ئەستەموڵ چ لە ڕووی بابەتی شیعرەکانییەوە چ لە ئوسلوبی شیعری ئەودا؟!

٢- ئایا فکری نالی وەك شاعیرێك پێش هەموو شتێك ڕێگەی بەو بیر و هەستانە داوە کە لەو سەردەمەی خۆیدا زۆر لە مرۆڤە میسالی و خەیاڵ پەرستەکان ڕێگەیان بەخۆیان داوە؟! ئایا دژایەتی نالی بۆ شێخ و دەروێش و وشکە سۆفییەکان نموونە نین بۆ بیری ڕاپەڕیو و حاڵەتی شۆڕش لە فیکری شیعری ئەودا؟!. وە ئایا ئەمانە چ پەیوەندییەکیان بەنامۆیی نالییەوە هەبووە؟!

٣- ئایا ئەو مەبەست و خواستانەی کە نالی داوای کردووە و هەندێکی دوارۆژی خۆی هەر لە تونی دەروون و کەللەیدا ماوەتەوە و بردوونیە ژێر گڵ مەگەر لای ئەوانە درکاندبێتی کە زۆر نزیك بوون لێیەوە وەك ئەحمەد پاشای بابان و هاوڕێ کورد و تورکەکانی کە لە شام و ئەستەموڵ هەمیشە هاوڕێ و هاوڕازی بوون و ئێمە نازانین کە ئەمانە کێن و چ کارە بوون؟!

٤- ئایا لە بابەتی نامۆیی نالی دا بەشێوای و خۆ بیرچوونەوە خودپەرستی و لە دەستچوونی واقیع هیچ دەوری بینیوە لە شیعرەکانیدا و بەرچاو دەکەون؟!

لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا دەڵێین:

پیرەمێرد-ی ئەدیب و زانا دەڵێت: «لە نەزەر نالی دا شیعر ئەسڵ و غایەیە قەت بەوەسیلەی بەکار نەهێناوە. حەیات، عیشق، حەتتا حسیاتی باوکیی لە لای ئەو عیبارەتن لە شیعر»(٥) ئێمە تەواو لەگەڵ ئەم ڕایەی پیرەمێرد داین چونکە لای نالی شیعر غایەیە واتە ئامانج و ئەنجامێك دەبەخشێت و خۆشی هەر لە خۆیدا ئامانج بووە و بۆ ئەنجامێك

بووه ئایا نالی شاعیرێك بووه كه مەبەستی له شیعر تەنیا شیعر بووه ناوێكی شاعیرانه؟!

یاخود غایەیەك، هەستێكی قووڵ و بێ بنی ناخی قەڵەمی پێ گرتووه و ئیبداعی گەورەی شاعیرانەی پێ ئەنجام داوه؟

له وەڵامدا دەڵێین: شیعر لای نالی له هەردوو قۆناغی بوونی له كوردستان خۆی و نامۆبوونی له ولاتان وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانه بوون كه خولیای مێشكی جەنجاڵ و كاسی بوون و هەمیشه له خۆی پرسیوه و دووباره كردوومەتەوه زۆر باش لەوه دڵنیا بووه كه داهێنانی ئەو وەستایەتی شاعیرانه و جوانی وشه و قووڵی مانا لەو ڕۆژگارەدا تەنها لای خۆی بووه و هەرچەند چاوی گێڕاوه له ئەوعی شیعری خۆی، له پەیوەندی توندی مانا و شێوه و ناوەڕۆك، گرێدانی زانستی بەلاغەت بەزانستی ئەستێره ناسی و فیزیا و جوگرافیا و مێژوو ڕیازیات... هتد، ئەم جۆره غایەیه له شیعردا لای نالی له سەرەتاوه لای دروست بووه و گەشەی كردووه و چەندیش چووەته ساڵەوه ئەوەنده زیاتر هێزی شیعر و گوڕی داهێنانی باشتر و خێراتر بووه. ئێمه دەتوانین گەلێك قەسیدەی بۆ ئەم مەبەسته بكەینه نموونه و ڕاستی ڕایەكەمان.

ئوسلوبی شیعری نالی له حاڵەتی نامۆیی و هەستكردن بەنامۆیی بابەتی ئەو چ له بێ دەرمەتانی خۆی وەك كوردێكی دووره ولات و بێ پشتوپەنا، چ وەك دڵدارێكی بەمەرام نەگەیشتوو هەردەم له پەیوەندی تازەبوونەوه و بەهێزبوونی خۆیدا له تەفاعولێكی دینامیكیدا بەرەو پێش ڕۆیشتووه. شیعری ئەو، ئەوه بووه كه بتوانێت مانای قووڵ و وەستایەتی وشه و داڕشتن و بابەتی فراوان و فەلسەفی به ئوسلوبێكی نەرم و بێ گرێ و گۆڵ و شەفاف دەربڕێت، لەمەشدا ئەوپەڕی سەركەوتنی بەدەست هێناوه ولاتی نامۆیی و بێ دەرمەتانیی ئەو مرۆڤه گەورەیه هەمیشه بووه بەبیركردن و یادكردن و خەم خواردن بۆ چارەنووس و هیوای (وەسڵی مەحبووبه) و شادبوونی ڕۆحی.

بەحەسرەت عومری یەكباره فەوتا
مەگەر عومرێ دووبارەم پێ عەتاكەی
گوتت نالی ئەتۆ بمره ئەمن دێم
خوداكەی بێ خوداكەی بێ خودا كەی؟!

یاخود دەفەرمووێ:

دوور له تۆ هێنده بێ نارام و بێ حال كەوتووه
ئەی مەسیحایی عەسر لەو لێوانه دەرمانی ئەوێ

ڕووم ئەوا زەرد بوو وەك پایز لە هیجران –نالیا–
عەشق ئێستاکەش لە من سەیلی بەهارانی دەوێ

ئینجا ئەوەی لە شیعری –نالی–دا دیارە ئەوەیە کە ئوسلوبی شیعری لە دوای ناوهێنانی –حەبیبەی تێدا کەم دەبێتەوە و یاخود هەر نامێنێ و دەبێتە یادکردنی نیشتمان و ئوسلوبی بەهێزتر و توندتر و قووڵتر دەبێت.

(دڵی نالی کە ئەنیسی قەرەداغە ئێستەش
داخی سەرچاوە و دیوانەیی دار و دەوەنە)

کەواتە ئەو گۆڕانکارییە بابەتی و خود ناسییەی نالی کە لە شام و ئەستەموڵ بەسەر شیعر و ویژدان و هەستیا هاتووە وە فراوانی ئاسۆی بیر و هێزی شیعر وگوڕەی داهێنان و خەمی گەڕانەوەی بۆ نیشتمان و بینینەوەی حەبیبەی ماڵیاوا و دەوەن و شاخ و داری قەرەداخ بەلام لە کارکردن و داهێنان و پادشای تەختی بێ هاوتای شاعیریدا دنیا جوانتر خۆی نواندووە لە وەلامی پرسیاری دووەمیشدا دەڵێین کۆچکردنی نالی و سەفەری بێ گەڕانەوەی بۆ شام و ئەستەمۆل لەو ڕاپەڕین و یاخیبوونەوە بوو کە لە ناخیدا بەرپا بووە دەبوا ئەویش بەئەنجامی بگەیاندایە. ئیمە دەڵێین هەڵوێستی نالی هەڵوێستی شاعیرێکی یاخی و ڕاپەڕیو بووە ئەگەرچی لە ئوسوڵی شیعر و داب و خووی ڕێچکەی کلاسی لای نەداوە و هێڵی تازەگەری ناوی لە ناوا نەبووە بەلام نالی توانی شۆڕشێك لە ناوەڕۆکدا بکات، شۆڕشێك و یاخیبوونێکی زانستییانەی شیعریی لە ماناداا بەرپاکرد. لەبەرئەمەیە نالی مامۆستای یەکەم قۆناغی دەستپێکردنی هەنگاوی یەکەم و ڕەسانەیەتی شیعری کوردی دادەنرێت. خۆشەویستی وشەی کوردی و زمانی کوردی لە ناخیدا چەسپیوە و مایەی شانازی ئەو بوون. لە لایەنی دووەمیشەوە وەستاندنەوەی بەرانبەر بیرو بڕوپووچەکانی ئەو سەردەمە زیاتر گیانی یاخیبوون و شۆڕشیان تێدا بەرپا کردووە و کردیانە خاوەن هەڵوێست وە لە دوای دەسەلاتی –بابان–یش هەر ئەو بەرەیە بوون کە دەستیان نایە ناو دەستی یەك بۆ دروستکردنی هێزێك کە نالی بێزار و ناچار بکەن ڕوو لە ولاتی نامۆیی بنێ و باوەش بەئازاری دووری و بێ دەرمتانیدا بکات.

لێرەدا دەپرسین، ئایا لە بابەتی نامۆیی نالی دا بیر شێواوی و خۆ بەرچوونەوە و خودپەرستی و لە دەستچوونی واقیع هیچ دەوری بینیوە لە شیعریدا و بەرچاو دەکەون؟! دەڵێین:

نەخێر بەهێی بارودۆخی ئەو ڕۆژگارە و پێوانەی بە قوتابخانەیەکی نەدەبی دەڵێین:

نالی شاعیرێك بووه له قوتابخانەی ڕیالیزم چ له حاڵەتی واقیعی ژیانی خۆیدا و تێگەیشتنی له باری ئەو واقیعه تاڵه و لێکدانەوەیەکی مەوزووعییانه بۆی وه چ له وێنەکێشانی ڕۆژانی ڕابردوو وه پێشبینی داهاتوو نالی دەڵێت:

«تەحریری خەیاڵ و خەو ئەگەر بێته حیسابی
دەروێش و گـــەدا شـــــاهو دەبێ شاگەدا بێ»

یاخود دەڵێت:

«چونکه نالی لەسەر ئەو ئەرزه غەریبی وەتەنی
هەستەبـــاری مەدەنی بەمەدەنی بـــــەمەدەنی»

لەم ڕووەوه واتـەیەك لـه کـتێبی –الشعر فـي أطـار العـصر الثوري– دا هـاتووه دەڵێت: «ڕۆشنبیری شاعیر مەرجی بنەڕەتییه بۆ تێگەیشتنی له ژیان. سەرکەوتنی شاعیر لەوەوه نایەت که باسی ئەو واقیعه بکات که تیایدا دەژی بەڵکو چۆنیەتی کارەساتەکانی ژیان لێکبداتەوه شاعیر ناتوانێ دوو ویژدانی هەبێ ویژدانێ لەگەڵ خۆیا کاری پێ بکات و ویژدانێکیش لەگەڵ خەڵکا. ئەدیبی ڕاستەقینه بەیەك ویژدان ڕووبەڕووی خۆی و کۆمەڵ دەبێتەوه چونکه هەست ئەکات که گیروگرفته تایبەتییەکانی خۆی له گیروگرفتەکانی کۆمەڵ جیا نابێتەوه و هەر ئەو گیروگیرفتانەشن که ئەو هەوێنی شیعرەکانی لێوه دروست دەکات»[٦] نالی دەکاته ئەوەی که بەراوردکاری بکات واقیعی خۆی و بابەتەکانی سەردەم ڕوون بکـاتـەوەو و ئـەگـەرچـی بـوونـی خۆی بـەبـەیدی مـەجنون– بشوبهێنێ بـەلام ئـەو (حومقەی که عەلاوەی کەری)یەی بەخشیوه بەکێ و دەیەوێت بڵێ چی؟!

(بەیدی مەجنونه وجودم له هەموو بەر بەرییه
نه کەسێ مونتەفیعی یەك بەری یا سێبەرییه
چـیت لـه کـاکـۆڵـی سەروموی مـیـانـی داوه
هەموو هەر هەم و پەرێشانی و دەردی سەرییه
بـەر یـابـاری تـەکـالیـفی ڕوسومـی بـۆ خـەڵق
چ دەکێشێ؟ ئـەمـه حومقێکه عەلاوەی کەرییه
لـۆمـەیـی نـالـی دێوانـه مـەکـەن ئـەی عوقـەلا
ئـەمـه مودەیکه زەدەی لـەتـمەیی دەستی پەرییه

بۆ وەلامدانەوەی ئەو پرسیارەی بەرەو ڕووی خۆمان کردەوه که دەڵێین ئەو مەبەستانه

چی بوون کە نالی زۆری لا مەبەست بووە و کەمێکی کەمی لێ دەربڕیوە؟! ئەگەر بێت و ستایشی ئاینی و چەند شیعرێکی موناسەباتی لێ دەر بکەین چەند قەسیدەیەکمان بەرچاو دەکەوێت کە ئاشکرایی ئەو مەبەستانە تێکەڵ بەواقیع و کارەساتی دووری و نامۆیی نالی دەربڕێت وەك دەڵێت:

(زاهیر و باتین لەسەر لەوحی حەقیقەت یا مەجاز
ئاشنای سڕڕی قەڵەم بێ غەیری نالی کەس نەما)

یاخود

( فاتیحە –تەخسیرە شاری دڵ بەتابوری ئەلەم
مودەتێکی زۆرە پاتەختە لە بۆ خاقانی خەم
حوکمی قانونی سەفا ڕۆیی لە ڕەومی ڕەومەدا
تا هومەیدا بوو لە ڕووما گەردی ئاشوبی عەجەم
تۆزی ئابینەی سکەندەر وا بەدەم باوە وەلێ
گەردی دامانی غەریبانە بلووری جامی جەم)

لە ڕاستیدا دوو ڕێگە هەیە بۆ تێگەیشتن لەو حاڵەتە تایبەتییانەی دەبنە سەرابای شاعیر و شاعیریش دەبێتە ئەوان– لێرەدا نموونەی بیروڕاو واتەی دوو زانا بە بەراورد لەگەڵ جیهانی نالی دا دەنووسین، ئیفلاتون دەڵێت: «شاعیر ناتوانێت لێکدانەوەیەکی ئەقڵی بۆ هەر شتێك بکات وەك چۆن کارسازێك یاخود دکتۆرێك یاخود دەریاوانێك ئەنجامی دەدات بەڵکو شاعیر هۆیەکە بۆ گواستنەوەی ئەو سروشەی کە بۆی دێت»(٧) ڕای دووەمیش کە پێچەوانەی ئەمەیە وتەی (سانت بیف)ی فەرەنسی نووسەر و ڕەخنەگرە کە دەڵێت: «یەکەم هۆی کاریگەر لە هەر شیعرێکدا کەسێتی شاعیر خۆیەتی یاخود بەشێوەیەکی وردتر بڵێین ژیانی تایبەتی ئەو ژیانەی کە مەزاج و بیروباوەڕێکی تایبەتی بۆ دەخولقێنێ»(٨) وە ئەم ڕەخنەگرە داوای کرد کە لێکۆڵینەوە لە شیعر لێکۆڵینەوەیەکی سایکۆلۆژی کۆمەلایەتی بێت، بەرانبەر ئەو دوو ڕایە دەڵێین: «لە زۆر لە دەقەکانی ئەدەبی کوردی بەتایبەتی لە شیعردا هەیە کە خەیاڵ و دوورکەوتنەوە لە واقیع و بڕوا بوون بە سروشتی شاعیریی بەهێزێکی نەزانراو بەهێز و نادیاریی دەزانێت. وە هەر لە سەردەمەکانی زۆر کۆنەوە یەکەم کەس کە بەیت و باوی ئەو جۆرە بیرکردنەوە ئایدیالییانەی هەڵوەشاندەوە و ڕووی بەرەو جێگایەکی تر وەرچەرخاند– ئەرستۆری

فەیلەسووف و زانابوو. کە دەتوانین مەرجی یەکەم بەردی بناغەی بیری ماتریالی لەوەوە دەستنیشان بکەین ئایا ئێمە مەبەستمان ئەوەیە کە نالی بە شاعیرێکی ماتریالی دابنێین؟! وە هیچ مافێکی بیری ئایدیالی پێ نەبەخشین؟! نەخێر، بەڵکو شاعیر خۆی لە خۆیدا پڕ بەپڕی بیری ئاینی ئەو سەردەمە وەك مەلایەکی هۆشیار هەر هیچی لەو شتانە نەزانیوە و نەیبیستووە کە ئێمە ئێستا ناوی دنیای -ماتریالی- ڕاست و بەگژاچوونی خەرافیات و بەدووداچوون و هەوڵدانی بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە زانیاری ئەستێرەناسی و فیزیا دەرکی بەزۆر لەو لایەنان کردووە بەلام مەودای ڕۆژگار و کزی دەوری فەلسەفی لە ڕۆژهەلاتی ئەو کاتەدا نەزعەی خەلافەتی ئاینیی عوسمانی زۆری لەم بیرانە لە پشت پەردەوە داناوە و تۆزی ڕۆژگاری دێرینی لەسەر نیشتووە. وە نالی شاعیریش هەر بەناوات و حەسرەتەوە وەك زۆر ئاواتی دوور و بەدی نەهاتووی لە ڕۆژگاری ئەو سەردەمەدا دەنگی بەرز و دڵ نەواز و واقیعیانەی تێکەڵ بەگەردەلوول بووە و ڕاپێچی کردووە و لە پاش مەرگیش ڕۆحی نەحەسایەوە و ئەو هەموو بەرهەمە پیرۆزانەی بەدەستی کەسێکی نەزان بوونە ئاگر.

سەرچاوەکان:


١- مژدەی دوزینەوەی ساڵی تیا مردنی نالی -محمد مصطفى حمه بۆر ڕۆژنامەی هاوکاری ٢١/٧/ ١٩٨٣

٢- ڕۆژنامەی ژیان ژمارە (٢٩٣) ئەیلوولی ١٩٣١ خەموتێکی بێ هەمتا.

٣- نالی لە دەفتەری ئەمریدا- معروف خەزنەدار.

٤- دیوانی نالی- مەلا عەبدولکەریم مدرس ١٩٧٦.

٥- سەرچاوەی ژمارە دوو.

٦- الشعر في أطار العصر الثوري- د.عزالدين اسماعيل.

٧- الشعر و الألهام -مجيد محمود مطلب- اقلام- العدد (٨) ١٩٧٥.

٨- هەمان سەرچاوە دەربارەی سانت بیف.

٩- تێبینی: ئەو شیعرانەی لەم باسەدا بە نموونە هێنراونەتەوە لە دیوانی نالی مەلا عەبدولکەریم وەرگیراوە.

# تیشکەکانی جوانی لە -زریان-دا

(هەرچی جوانی هەیە لە جیهاندا ئەگەر تەنها ڕۆژێك پێش مردنم بمرێ ئەو کاتە ئەتوانم شیعرێك بنووسم باسی پێکەنین بکات)(١) پێکەنین لەم واتایەی -حسێن مەردان-دا ئەگەر بێت بەپێچەوانەی گریانەوە تەماشا بکرێ و پێوانەی بۆ دانرێ بەبێ وریایی و تێگەیشتن لە مانا فەلسەفی و مەنتیقیەکەی گریان و پێکەنین تێڕامان لە جوانی و ناوەڕۆکی جوانی ئەوا لە ڕووە هونەرییەکانەوە ناتوانین لەو خەمە بگەین کە جوانی چ وەك خوریەیەك یاخود وەك لێکدانەوەیەکی مرۆڤانە لە ویژدان و هەستی کەسێکدا دروستی ئەکات. جوانی لە پێوانە کردن و ژمارە بۆ دانانیدا سنووری نییە. هەموو شت بەپێی ئەو ڕواڵەت و ناوەڕۆکانەی تیایدا هەیە جوانی خۆی مسۆگەر ئەکات ئیتر لە دانانی پلە و ڕوانینی مرۆڤەوە دێنە دی لە مەزاج و هەڵکەوتنی باری نەفسی ئەوەوە دروست ئەبێ، لەو خەمەشدا کە جوانی وەك ڕواڵەت و ناوەڕۆکیش ئەیبەخشێ لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازی هەیە و ئەگۆڕێ.

جوانی بەپێی زۆربەی لێکدانەوە فەلسەفی و ئەدەبییەکان لە کاری هونەری هونەرکاریدا بەرنەکەون، جوانی لای بۆ دلێرو کروتشە بەو جۆرَ تەماشا ئەکرێت. هۆمیرۆس یەکەمجار لە شیعردا وشەی جوانی بەکارهێناوە لە دوو لایەنەوە بۆی چووە. لایەنی یەکەم لەو شتە واقیعیانەدا کە هەستیان پێ ئەکەین و لە ڕێی حەواسەوە نرخ و، چۆنیەتییان دائەنرێت. دووەم بریتییە لە بەهرەیەکی خودایی لە لایەنی دووەمدا هۆمیرۆس تەواو ئەچێتە بەرەی لێکدانەوەیەکی ئایدیالیستیانەوە بۆ جوانی چونکە فەلسەفەی ئایدیالستی جوانی بێ سنوور ئەوپەڕی کەمال و گەورەیی لە زاتێکدا ئەبینێ کە زاتی خودایە و مرۆڤ ئەو خۆشەویستی و جوانییە لە دڵیدا هەڵئەگرێ و ئەیپارێزێت، ئەمە کەمتر بەلای مێشکدا ئەچێت واتە ئەبێ بەکارێکی ڕۆحی و لە عەقڵ دوور ئەکەوێتەوە «کروتشیە» کە دەستێکی باڵای هەبووە لە زانستی جوانناسی و بەخاوەنی ڕێبازێکی تایبەتی خۆی دائەنرێت لە ئیستاتیکیدا فەلسەفەکەی ڕۆحییە ئەڵێت: «جوانی تەعبیرە و لە کاری هونەری دایە» لەم لایەنەوە ئەگەر بڵێین جوانی تەعبیرە لە ڕواڵەت و ناوەڕۆکی باری کۆمەڵایەتی و واقیعی جیهان و هەستکردنی کەسانی کۆمەڵ و ئەنجامی مامەڵەکردنە لەگەڵ سروشتدا و ئەمانە هەموو لە کاری هونەریدا دێنە دی بە

ڕێك وپێکی -متناسق- ئەوەستن ئەوا لایەنی ڕۆحیی لە جوانیدا و هەڵسەنگاندنی بیری مادیی بۆ جوانی لە یەك جێگەدا تێکەڵ بەیەك ئەبن. ئەمەی من سەبارەت بەجوانی بەلێکدانی دوو هێڵ و ئاوێتە بوونیان جوانی ئەگاتە ئەو جێگەیەی بتوانم بەشێوەیەکی ڕۆحی و دڵنیایی لێکدانەوەی خۆمی تیادا ببینم. (ناتەواوی سەرەکی زانستی جوانناسی پێش مارکسیەت لەوە دابوو کە بەدوای چالاکییەکانی جوانناسیدا ئەگەڕا دوور لەو ئەو چالاکییە کۆمەلایەتیانەی تر)(۲) ئەو چالاکییە کۆمەلایەتییانە لای هەندێ کەس وەها نەبینرێ کە ناتوانرێ لە هونەردا بەتایبەتی وێنەکێشان و شیعردا ببەسترێتەوە بەبایەخترین ڕووەکانی جوانناسییەوە. ئەوانە یاخود تەنها لایەنی ڕۆحی ئیستاتیك وەرئەگرن یا وەکو بروایان ڕواڵەت و ناوەڕۆکی جوانی نییە لە فەلسەفەی ماتریالیدا. لە شیعری ئەنوەردا ڕووی ستاتیك لەو دوولایەنەوە دەرئەکەوێ: یەکەم: لایەنی جوانی تەنها وەك وێنەی شیعری و ڕازاندنەوەی وشە لە بەکارهێناندا و تەعبیری جوان لە شتی جوان. دووەمیش: لایەنی بەستنەوەی فۆرمی جوانی و گۆڕان و چۆنیەتی باری کۆمەلایەتییەوە کە بەپێی ئەمە ئەو تێگەیشتنەی شاعیر لە ڕووی نەتەوەیی پێشکەوتن خوازانەوە وەك دیارده و بنچینەیەك دەرئەکەوێ.

ڕووی یەکەم:

دوێنێ تۆم دی لە ئاسمانا
هەموو شینایی ساماڵت کردبوو بە ڕەفتە بۆ سەرت
دوێنێ تۆم دی لە ئاوێنەی شەپۆلێکا
دڵی ئاسۆت کردبووە گوڵ
دابوت لە یەخە و کەمەرت

ڕووی دووەم:

ئەی خواکەی غەریبان تۆ
لە هەوری ئاڵەوە بە پێی پەتی
کەی دێیت و کەی تۆ پەیامێ بۆمە دێنی و
کەی بە هەموو جیهان ئەڵێی
ئا ئەمانە جگەرگۆشەی بێ ناز کەوتووی زەوی منن
-وێنەکانم گۆرانیەکەی پۆل ڕۆبسن-ن
هەنگاوی دەنگ بەسەر هەموو سنوورێکی

دوورا ئەنێین
لە جەنگەڵی گیانی شەوا گوڵی پشکۆن و ئەسووتێن).

لای زوربەی شاعیرەکانمان بەهۆی تێگەیشتنیانەوە لە ڕاستەقینەی کاری جوانناسی لە یەك ڕووەوە ئەو مەبەستە بەکارهاتووە. سۆزێکی گەرم -هەڵچوونێکی کاتیی بەهۆی جوانییەکی ڕواڵەتییەوە شیعری پێ وتوون. گەلێ جار شیعرەکە کەوتووەتە ژێر کاریگەری ئەو سۆزەوە ئەویش لەبەرئەوەی ئەو جوانییە ڕواڵەتانیەی سۆزێکی دەروونی پێ بەخشیوە و بووە بەساتێکی شیعریی و ئەمە شتێکی ئاسایی و چاوەڕوانکراو نەبووە، چونکە وەك ئاشکرایە هەمیشە شتە چاوەڕوان کراو و کتوپڕەکان بینینی ئەوپەڕی خەم یاخود جوانی تیاباپدا لای شاعیر ئەبنە گەورەیی و مەزنی و هانا بۆ بردنیان بۆ ئەو ڕواڵەتانە کراوە نەبووە، چونکە وەك ئاشکرایە هەمیشە شتە چاوەڕوانکراو و کتوپڕەکان بینینی ئەوپەڕی خەم یاخود جوانی تیایاندا لای شاعیر ئەبنە گەورەیی و مەزنی هانا بۆ بردنیان بۆ ئەو ڕواڵەتانەی شیعرەکەی پێ ئەڵێن. بینین و هەستکردن بەجوانی لای ئەنوەر جیاوازە و لە سنووری خورپەیەکی ناوەخت و ساتێکی شیعریی تێپەڕێ و بەناوەڕۆکی ژیان و دیاردەکانی جوانی و خۆشەویستیدا ڕۆ ئەچێ (خاکی کوردستان -گۆرانییەکانی پۆل ڕۆبسن- گۆلاوە شینەکەی دەربەند- بەخوڕ ڕێژنەی سەوزی نووری خوا) جێگەی مەنتیقی دیاریکراوی خۆیان هەیە کە هەست ناکرێ وێنەیەکی شیعری و تەعبیرێکی فۆتۆگرافی لە جێگەی موناسبی خۆیدا نەبێت. ئێمە ئەگەر لەو زەمینەیە پێ دلگرین کە شیعری فۆتۆگرافی ڕۆمانتیکیانەی نوێی کوردی لێوە هەڵچوویێ هەر چۆن بێت لە -گۆران-ەوە دەست پێ بکەین. وە لەمەشدا ئەتوانین بڵێین لە سەرەتاوە کە گۆران بڕوای تەواوی ڕێبازی هونەری بۆ هونەری هەبووە ئەو وێنە و دیمەنە جوانانە لای ئەو لە ڕواڵەت و دیوی دەرەوەیان لە عاتیفە و هەستی جوانپەرستی گۆران-دا چرۆیان کردووە و گوڵیان گرتووە. توانیویانە گرێی خەمێکی قورس و ماتی و خامۆشیەکی کپ و سووتێنەر لە دەروونیا هەڵبگیرسێنن بەمەش ئەوەی لە توانای سطیقە و دەرفەتی دەربڕینیا بوویێ بەشیعری جوان تەعبیری لێ کردووە. شیعرەکانی -بەهەشت و یادگار- فرمێسك و هونەر- دوو هاوینە گەشت- سروشت و دەروون- نموونەی ڕاستی بڕیارەکانمانن، بەرهەمی شیعری گۆران تەنانەت لەو وێنە فوتوگرافی و وێنە شیعرییانەدا کە باس لە جوانی خۆشەویستی ئەکات و سەرەتای شیعر وتنی بووە لە نوێکردنەوەکەیدا دوور نە وەستاون لە هەر هەست و بۆچوونێکی مرۆڤانە. بەڵکو لە

هەندێکیشیاندا جوانی ئافرەت بەتایبەتی تێکەڵ بەڕووداوەکانی کۆمەڵ ئەبێت. ئەو کارەساتانەی کە ئەنجامی ڕژێمی دەرەبەگی و دەسەلاتی ئەو ڕژێمە لە کۆمەڵدا ئەیهێنایە دی. لە بووکێکی ناکام و تۆبەڕێتی ئەنجامی یاران و بەردەنووسێك– و هەندێکی تریشدا ڕاستی ئەمە دیارە لە لام لەو سەردەمەدا جوانییەکان لای گۆران بەدیوی دەرەوەیانەوە بەسترابوون، خەمی گۆران–یش کە لە جوانیدا پێك ئەهات جیاوازی نێوان جوانی و جێگەی جوانییەکە بوو– ئافرەتێکی جوان لە بارێکی ناهووری نزمدا– ئافرەتێکی جوان لەگەڵ هاوسەرێکی بەتەمەن یاخود پیاوێکی زۆردار یا ڕێکەوتی ئەو ئافرەتە لە کات و جێگەیەکدا کە شایەنی جوانی ئەو نەبێت لای گۆران جوانییە و گەورەیی و لە جێگایەکی وا بچووك و نزمیشدا دانرابێ و وەها مامەڵەی لەگەڵ بکرێ ئەوا ئەمە تەواو سەرچاوەی خەمە. گۆران زیاتر پێشکەوت لە سالانی دوایی شیعر نووسیندا لە ڕووی بابەتی جوانناسینەوە وەك لە مۆسکۆی جوان– و –وەلامی پرس– وە بێداریەك– ڕێگای لینین و هەندێکی تریشدا. لێرەدا کە باس لە گۆران و ڕوانینی ئیستاتیکی ئەو ئەکەین مەبەستمان دۆزینەوەی جیاوازی ئەو هەڵسەنگاندن و نرخاندنەی جوانییە لای دوو شاعیری داهێنەر و جوانناس و عاشق –واتە گۆران و ئەنوەر– چونکە دەربڕین و مامەڵە کردنەکەیان تەواو جیاوازە و هەر یەك وەستایەتی و سەلیقەی خۆی لەو بارەیەوە بەکارهێناوە و جێگای خۆیان دیاری کردووە. وە وتم لە زۆربەی بەرهەمی سەرەتای تازەکردنەوە شیعرییەکەی گۆران–دا کاریگەری جوانییەکە ڕواڵەتیی بووە بەلام ئەنوەر هەر لە سەرەتاوە بەپێی جیاوازی ئەو فەترە زەمەنییە بۆ جەوهەری جوانییەکە چووە و بەمندالانی کوردستان و گۆرانی مرا ببوسە و خواکەی غەریبانەوە توند گرێی داوە –لەم شیعرانەی گۆران–دا بەراوردمکە ئەدۆزینەوە لە دوور و نزیکی بۆ هەستی جوانی ئەو و ئەنوەر–دا.

–بۆ ئاینم ئەگەڕێ
هەندێ کەس
با جار بدرێ
تۆیت و بەس
قیبلەی ئاین و باوەڕم
خوای بەهەشتی دڵی تەڕم–
–بەلەعنەت بێ زوهرەی جوانی سروشتی
دائەفلیقێ هەر دڵێ کەوتە مشتی

له پاش تێپەڕینی سنووری هونەر بۆ هونەر بەر فراوانی دنیای جوانی و مرۆڤایەتی و خۆشەویستییەك كە خەڵكی تریش بگرێتەوە شیعری ستاتێكی لای شاعیر ئەبێت بە:

-چەخێری نیشتمان چە ئارەقی ڕەنج
كوردستان سەرانسەر پڕ ئەكا لە گەنج
باخچەمان سەرانسەر گوڵی ئەپشكوێ
بلبلمان فێر ئەبێ بەئاوازەی نوێ
تەنانەت لە بێشكەی ساوامان گریان
ون ئەكا موعجزەی بەختیاری ژیان!-[4]

- دروستبوونی هەستی جوانپەرستی لای مرۆڤ كارسازاندنێكی درێژخایان و تێكچڕژاوە كە لە پێشكەوتنی هونەر خۆی جوێ نابێتەوە[5] ڕادەی گرنگی تەعبیر لێكردنی هونەریمان بۆ دەرئەكەوێ لە هەر ڕواڵەت و ناوەرۆكێكی جوانی كە بیخاتە هەڵسەنگاندن و بەر تیشكی هەستی لێكدانەوەی جوانناسی خۆیەوە، لێرەدا ئەپرسین جوانی چییە؟ وە ئایا شتی جوان چۆن ئەچێتە كاری هونەری جوانەوە؟ من لای خۆمەوە پێناسەیەك نادۆزمەوە بۆ جوانی بەكاربێت و بكرێتە دەستوورێكی دانراو و قیاسێكی نەگۆڕاو وە هەمیشە بۆ نرخاندنی ڕادەی هەموو جوانییەكان بەكاربێت. بەڵكو بەلای منەوە دۆزینەوەی پێناسە بۆ جوانی كارێكی نەشیاوە و لەبەرئەوەی جوانی خۆشی سنووری نییە و پڕە لە نهێنی وەها كە مرۆڤ تەنها تروسكەیەكی لێ ئەبینێ و جۆرە سیحرێكی سەرسوڕهێنەری تیادایە و مرۆڤ كەیل و مەست ئەكات ئەیخاتە حالاتی سەیرەوە بەشێوەیەكی هاوشان چەندە مرۆڤ خاوێن بێت ئەوەندە زیاتر هۆگری جوانی ئەبێت و تیایدا ئەتوێتەوە. مەبەستم لە خاوێنی مرۆڤ هەستی مرۆڤانە و پێوانەی مرۆڤانەی ئەوە. چونكە كاتێ مرۆڤ لەو هەستە دائەبڕێ و كاری نامرۆڤانە ئەنجام ئەدات گوڵێكی جوانی گەشاوە -تابلۆیەكی پڕ لە تەعبیر و بیری ورد و ڕەنگی گەش و تاریك پڕشنگی چاو و جوانییەكانی ئافرەت شینایی ئاسمان و ئەستێرە لای ئەو هیچ بابەخێكی نابێ و تەنانەت كارتێكردنی جوانی ئافرەت و نهێنی جوانیی ڕواڵەتی و توانای سیحری سەرسام كردنی مرۆڤی جوانناس لای ئەو تورەهاتە و هەرگیز بیری لێ ناكاتەوە. هەر لەوەش ئاگادار نییە كە مرۆڤی گەورە چۆن لە بەرامبەر سیحری جوانیدا تەسلیم ئەبێ و هەموو گەورەیی خۆی، هەستی جوانناسی و لێكدانەوەكانی لە هەر ساتێكدا بن لە خەندەیەكی خاوێنی فریشتانەی سەر دوو لێوی جواندا ئەتوێتەوە و ئەبن بەشتێكی

پیرۆز. بەلام لە هەمان کاتدا لەگەڵ هەموو ئەو تەسلیم بوون و هانا بۆ بردنەدا هەر ئەو خاوەن ئیحساسە ناسکە هەڵوێستێکی مرۆڤانەتر و قووڵتر وەرنەگرێ و ئەودیوی نەرمووەی جوانییەکە سڕ نابێت و ئەیەوێ باخی ببێت: (ئەزانم تۆ وەك منالێك تەماشام ئەکەی کە هەندێ جار پێویستە یاری بکات وە دڵنیای ئێواران ئەگەڕێتەوە بەلام خانەکەم بەداخەوەم کە من هەتا هەتایە ناگەڕێمەوە ئەویەڕی گەمژەییە پیاوێك بەردەوام بێ لە خۆشەویستی ئافرەتێکدا کە ئەتوانێ خۆی بەجێ بێلێ)(٦) شتی جوان ئەگەر ئەچێتە کاری هونەری جوانەوە تەعبیری لێ ئەکرێ ئەوا لە ناخی مرۆڤدا لە توێی هەستی مرۆڤانەی ئەودا جێگیرە و ئەزانێ چەندە لێوەی دوورە یاخود نزیکە سروشت و تاقیکردنەوەی مرۆڤ لەگەڵیدا لە هەر سەردەمێکدا بوویێ توانیویەتی سەرنجی مرۆڤ ڕابکێشی بەلای شتە جوانەکاندا و بیری ڕوانینێکی وەهای بداتێ کە بتوانێ لە شتە ناشیرین و خراپەکانیش بگات.

لە شیعری ئەنوەردا ئەم دیاردەیە لە تێکەڵێی ئەو خۆشەویستی خاکەکەی و مرۆڤەکانی دنیاوە دێتە پێشەوە بیرکردنەوەکان لە جوانی گەورەتر و گەورەتر ئەبن:

(جارجار کەژێ دەمی تینووی
بۆ ڕوومەتی ڕووبار ئەبا و هەر پێی ناگا
دوایی ئاوڕ لە کانیاوی سەر سینەی خۆی ئەداتەوە
کانیاوەکان کیژۆڵەی سرت و بزێون پێ ئەکەنن- لە ژێر دەستی
ڕائەپسکێن- ئەڵێن ئێمە دڵۆپ دڵۆپ- ئەبین بەشیرینیی ڕووبار)

نموونەی تێکەڵی شتە جوانەکان بەکاری هونەری جوان و هەست بزوێن لەو شیعرەی سەرەوەدا دەرئەکەوێ- کەژ و ڕووبار سەرچاوە و کانیاو- کانیاوە سرت و بزێوەکان- لە دەلالەتی وشەی ئەنوەردا قووڵی مانا و بەرفراوانی هەستێکی شاعیرانە پێکدێت تەنها تەعبیر لێکردنی ئەم لە جوانی گوێزانەوەی ڕەنگ و مادەی سروشت و مرۆڤ نییە بۆ تابلۆکی شیعریی بەڵکو لە ئامادەکردنی بیری گوێزانەوە و داڕشتنەوەی ڕووە جوانەکانی لە قالبی هونەری بەرزدا و بەستنەوەی جەمسەرەکانی ئەو هونەرکارییە بەبیری مرۆڤانە و ڕوانین لە ژیان بەچاوی هیوا و گەشبینییەکی زۆرەوە، ئایا هەموو کارێك کە مرۆڤ بەرانبەری سەری سووڕ بمێنێ و حەزی لێ بکات هونەر و هونەری جوانکاری تیادایە؟ بەلای منەوە ئەمە وەها نییە چونکە نیستاتیك بنچ بەستە بەمرۆڤەوە- بەبزواندنی شتە مادییەکان و سەراپای سروشتەوە وە هەر کاتیش مرۆڤ بۆ هەستێکی سادە و ساتێکی

کەم خایەنی ئارەزووەکانی خۆی پەنجەی لەسەر جوانییەکان دانا و لە پشت هەر جوانییەکەوە ئازاری مرۆڤ رادەی سەربەستی و کەم و زۆری موعاناتی هونەرمەند و جوانییەکانیش وەك شتی جوان نەدی ئەوا پێوانەی ئەو بۆ جوانییەکان لە حەقیقەتی جوانییەکان دوورە و تەنها توێکڵ و دیوی دەرەوەی ئەبینێ و بەلا ڕێدا ئەڕوا و لە کەنارەوە دەڕوانێت.

جوانی سیفەتی هەموو شتە –هەموو شت ئەوەندەی ماهیەتی خۆی جوانیی تێدایە. ئیتر شێوەو هەڵکەوتنی جوانی ئەو شتە مەرج نییە لەو جوانییانە بێت کە لە گۆنای ئاڵی ئافرەتێك و نەخشی پەڕەی گوڵێکدا هەیە، بەڵکو جوانی تەنانەت لە گریان و پێکەنینی مرۆڤیشدا دێتە دی. زۆرجار جوانییەکان ئەگەنە ڕادەیەك و وەها گەورە و قورس ئەبن لەسەر شانی شاعیر و دڵی وەها لە جێگایاندا گیر ئەبن پیاڵەکەی پڕ ئەبێ و سەر ئەکا و لێوەی ئەڕژێ. بەرەو چەند مەیل و بۆچوونێکی ڕۆمانتیکییانەی ڕەشبین و بێ وورە ئەچێت. ژیان و کارەساتەکانی بەخەم و تەم ئەبینێ پرسیار ئەکات– ڕائەمێنێ سەرسام ئەبێ بەربەستی فرمێسکەکانی بۆ ناگرێ بەسەرخۆی و هەوێنی کارەساتدا بەخوڕ ئەگرێ:

– بۆمات ئەبم
ماڵی ئاوای دڵدارانی ئەم وڵاتە هەر ئاوایە
شادیش ئەبێ بەخەم هەموو دەم ئاوایە
من خەمیشم چنگ ناکەوێ
تاکو بیکەمە پرپۆلەی پێچووە شیعرە برسییەکانم

لێکدانەوەی ماتی و خەمی شاعیر تەنها بەو ڕووداوەیە کە تووشی بێ هیوایی ئەبێ و ئەگەرچی بەدوای خەمێکیشدا ئەگەڕێت کە بیکاتە خۆراکی شیعرەکانی بەلام هەر نییە! بەو مەبەستەش ئەگەر بڵێین خەم شۆڕشە. خەم بیر و لێکدانەوەی بەجێ و یاخیبوونە هێشتا شاعیر هەر ئەچێتە بەرەی وورە بەردان و ڕەشبینی مەسەلەکەوە سیفەتی جوانناسی لە بۆچوونەکەی دائەبڕێ و ئەم دەستەوستان دائەنیشێ و شتێکی پێ ئەنجام نادرێ:

– شیعرەکانم چاویان هەموو
پڕ لە تەمە –خەمە– تەمە
– شێوەی ونی یارەکەمم
هێشتا بەخەویش نەدیوە.

کاتێ شاعیر کە ئەم شیعرانەی خۆی بەند و بنج بەستی کێشەیەك بوو کە بیری نەتەوایەتی لە دەمارەکانیا تین و تەوژمی خوێنی بوو، بەپێچەوانەی گەلێ ڕوانینی شاعیرەوە لە زەمینەی خۆیدا هەڵ نەچوو وە پەخش و بڵاو نەبوەوە. ئەو نەك هەر یارەکەی خۆی سەدان جار دیوە هەر لە سەرەتاوە دەستنیشانی کردووە و شێت و شەیدای ماچێکی بووە بەڵکو خەرمانی شیعری بۆ هەڵداوەتەوە و لەو ساتە ڕەشبینانەدا نەبێ کە وەهای زانیوە تەواو لێی بزر بووە ئیتر هەتاهەتایە لە جێ ژوانێکدا خۆی نابێتەوە دەست بکاتەوە ملی و لێوی تێر هەڵمژێ ئەوە لە یاد ئەکات کە هەر ئەو ئەم گۆرانییە پڕ سۆزە خۆشەویستییەی بۆ وتووە لە ئامێزی گەرمی خەمەکانیا پەروەردەی کردووە:

تۆ ئاگری ماڵە کوردێکی کۆچەری بووی
– لە دوورەوە گەش گەش دیار بووی
ڕووم لە تۆ بوو هۆگرت بووم
هۆگری تۆم– چۆن هۆگری شەقەی باڵی
ئێوارانی مەلەکانم
هۆگری تۆم چۆن هۆگرێ
گۆرانی شەوانی شوانم– هۆگری تۆم

لێرەدا پەیوەندی نێوان تێشکانی عاتیفی شاعیر و بەئاشکرا ڕەنگدانەوەی لە کۆچی شازادەدا و هەموو ئاهە قووڵ و حەسرەتییەکانی تێکەڵ بەبارێکی ناهەمواری کۆمەڵایەتی و حەزە نەتەوەییەکانی شاعیر ئەبێت جۆرێکی تر لە پەنجەرەیەکی ترەوە تەماشای جیهان و ڕووداوەکانی ئەکات. لە هەندێ جێگادا بەرەو جۆرە ڕەشبینییەك ڕای ئەکێشێ و لە هەمان کاتدا ئەو حاڵەتی یەئس و ڕەشبینییە وەك دەربڕین و هونەرە تەکنیکییەکانی شیعر داهێنانی سەرکەوتووی پێ ئەنجام ئەدەن:–

ئەبێ دووریی زەوی و ئاسمان
وەکو بەڵگە بۆ ئێوانی خۆم و شیرین بهێنمەوە
ئەبێ باسی ئاوارەیی شۆڕە سواری گوندەکەمان
بۆ جاری هەزار و یەکەم
بگێڕمەوە–بیڵێمەوە

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە لایەنەکانی ستاتیك لە ڕێڕەوی ئاسینی جوانی

ئافرەتەوە چەند تیشکێکن کتوپڕ وەك برووسکە لە مرۆڤدا کاریگەری خۆیان ئەنوێنن. وە ئەمەش پەیوەندی بەهەڵکەوتنی دیوی دەرەوەی ئافرەتەکەوە هەیە و لەم شتانەدا کۆ ئەبێتەوە بالای پێستی- نەرم و شلی و پتەوی لەشی -ئای ڕوومەت و چاوی گەش و پڕ لە بریسکی تاڵە تیشکەکانی جوانی- قژی پەخش و خاو -قسەکردن و چاوترووکاندن و خەندە و شێوەی پێکەنین- جۆری ڕۆیشتن یاخود وەستان- دانیشتن و جۆری دانیشتنەکە- ڕوانین و... هتد. واتە بوونی تەناسوبێکی تەواو لە دیوی دەرەوە و ئەندامەکانی لەشیدا. ئەم تەناسوبە کە بریتییە لە -الجزء- کە سەراپا جوانن کۆ ئەبنەوە و هەموو -الکل- دروست ئەکەن بۆیە ناشێ چەند -جزء-ێکی ڕێك و جوان پێك بهێنن. زۆر لە فەیلەسووفە جوانناسەکان لەم بارەیەوە جوانی دیوی دەرەوە و ماهیەتی جوانییان ڕوون کردووەتەوە وەك ئیفلاتون و ئەفلۆتین ئیفلاتونیەتی نوێ بەلام لای ئیفلاتون جوانی ڕەوتێکی سێگۆشەیی وەرئەگرێ و تەمەنی ئەبەدی و هەمیشەیی نابێت. لە سەرەتادا دروست ئەبێ و گەشە ئەکات پەرە ئەسێنێ و ئەگاتە دوا پلەی جوانی و بەرزی خۆی بەلام لە پاشدا وەك گوڵ ئەژاکێ و نامێنێ و شوێنەوارێك لەو شێوە جوانە بەجێ نامێنێ. بەلام کاتێکیش جوانی و خۆشەویستی لە یەکترا بتوێنەوە و ئەبنە یەك پارچە لە هەست و بیری شاعیر و وێنەی جۆر بەجۆر دروست ئەکەن، ئەویش لە ڕادەی هۆشیاری و سەلیقەی خۆیدا ئەیکاتە شیعر لەو تەناسوبەی باسمان کرد لە ئەندامەکانی جوانیدا چ لە ئافرەتێکدا یان لە باخچەیەکدا لە ئاست ڕوانینی خۆشەویستیدا جیاوازی هەیە ئەشێ تین و پڕشنگی جووتێ چاو- پەڕەی گوڵێك سەرسامی بکا و هەموو بەشەکانی تری جوانی و خۆشەویستی تیادا ببینێ شێت و شەیدای ئەبێت و هۆگری بینین و هاوسەرێتی ئەبێ وەك بولبولێك بەدیار گوڵێ جوانییەکەوە ئەخوێنێ و هێلانەکەی خۆی دائەمەزرێنێ. واتە جوانییەکان ئەبنە خۆشەویستی، ئەم خۆشەویستییەش پەرە ئەسێنێ و لە سنووری شتە بچووکەکانی تێ ئەپەڕێ و بابەت و مەسەلەی فراوان و گەورە ئەگرێتەوە و خەریکیان ئەبێ -لامارتین- ئەڵێت ئەزانم ئەوەی قسە ئەکا و ئەناڵێنێ دڵە وە کاتێکیش دەست ئەنووسێ ئەوا هەر دڵە کە ئەتوێتەوە(٧) بەم شێوەیە دڵ فەرمان ڕەوایە و دڵ نیشانە و جێگای عاتیفە و کانگای خوریە و ئیلهامی خۆشەویستییە. هەر لە کۆنەوە ئەو ڕایە هەر وا هاتووە و چەسپیوە کە دڵ جێگای عاتیفەیە و سەر یا مێشك جێگای عەقڵە. لە هاوشانی کردنەوەی ئەو دوو دیاردەیەدا و زاڵ نەکردنی یەکێکیان بەسەر ئەوی تردا شیعری باش دروست ئەبێ ئێمە ناڵێین شیعر ئەبێ کارێکی عەقڵی بێت چونکە شیعر عاتیفە و ڕاچەنین و فرمێسك و پێکەنینە. دەلالەتی ئەو

وشانەش هەریەك مانای فەلسەفی خۆی هەیە. سەرەڕای ئەوەی کە ناوەڕۆك خۆی هەر لەو عاتیفە و ڕاچەنینانەدا ئەبێتە بابەت و فیکری شیعرەکە. ئەنوەر لە کۆچی شازانە کە حەز و خۆشەویستی خۆی پێوە بەستبووەوە ئەویش بووە ئەستێرەیەکی پرشنگدار و بەئاسماندا هەڵخزاو کشاو لە چاو ون بوو بەڵام بیرەوەری و خۆشەویستییەکی لای ئەو نەماوەتەوە بەردەوام کەم و زۆر دێنە شیعرەکانیەوە لایەنەکانی جوانی فەرامۆش ناکات و لەوپەڕی عاتیفەیەکی گەرمی شاعیرانەدا بیرکردن و بیرەوەرییەکان هەڵئەچن:

وەك مراوی سەر و باڵ سەوز
لە کەناری ڕووباری بیرەوەریتا
ئەڵئەنیشتیت، هەڵئەلەرزیت، بەکوڵ ئەگریت
ئەڵێی جاران شاعیرێ بوو
دڵی ڕەق بوو ڕەقیش ئەبوو
لەبەر گزەی ساردی خەما
هەڵئەچوو سەمای ئەکرد
ئەڵێ جاران شاعیرێ بوو
دڵی بەرد بوو، جۆگەلەش بوو

ئەنوەر- لە ڕوویەکی شاعیرانەوە جوانی دێنێتە شیعرەکانیەوە مامەڵەی لەگەڵ ئەکات. کە ئەڵێم ڕوویەکی شاعیرانە واتە وەرگرتنی ئیحا لە جوانی و لە بابەت و شێوەی دەرەوەی جوانییەکە و چوونە ناو ناوەڕۆك و بەستنەوەی بەجوانییەکانی تری دەرەوەی جوانی ئافرەت لە سروشت و جووڵانەوەی مرۆڤ کاری بیر و لێکدانەوەی هۆ و ئەنجامی ڕووداو و کارەساتەکان لە بچووك گەورە -لە دوور و نزیکیان- تا بەم شێوەیە جوانی ئەچەسپی و نرخی تەواوی خۆی وەرئەگرێ. مامەڵە کردنی ئەنوەر لە شیعرێکدا هەتا یەکێکی تر بەپێی پێشکەوتنی بیری شۆڕشگێڕی پەیدا بوونی وەعیەکی تەواو تیایدا لەگەڵ دەستەی مناڵانی دێیەکەی کە نموونەی مناڵانی بێ بەش و دواکەوتووی کوردستانن گەلێ جەمسەری مەسەلەی گەورە سەبارەت بەخاك و خۆشەویستی و باران- وەرە خوارێ ئەی خواکەی غەریبان -گولسوخی- نموونەی ڕووی پاك و بێ گەردی مامەڵەی شاعیرە لەگەڵ مناڵ و جیهانە خاوێنە بێ تاوانەکەیاندا.

-ئەبێ باسی ئاوارەیی
شۆڕەسواری گوندەکەمان

بۆ جاری هەزار و یەکەم
بگێڕمەوە

دووبارە بۆ ئەوەی هەزار و یەکەمجاری گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئاوارەیی شۆڕە سواری دێیەکەمان بۆ منالان دیوی تاریکی بیری جوانناسی شاعیرە و لە ژوورێکی بچووکی بێ سەروبەر پارچەیەك لە ئاسمان ئەبینێ و بڕیار بەسەر هەموو ئاسماندا ئەدات. ئەگەر وەك بەراوردێك تەماشای ئەم شیعرە و شیعری خەنجەر و خۆشەویستی بکەین، ورد بڕوانی بۆ هەڵوێستی شاعیر بەرامبەر کێشەی نەتەوەیی خۆی و کێشە سەختەکانی جیهان جیاوازییەکی تەواو ئەدۆزینەوە و هەست بە کەم نەفەسی و تەنگی بیر و ڕوانینی شاعیرانەی ئەکەین لە هەمان کاتیشدا ئەتوانین لەو پێشکەوتنە بگەین کە لە هۆنراوەی دووەم و خەنجەر و خۆشەویستیشدا هاتۆتە دی. بگرە هەر لەو ساڵەشدا -١٩٧٣- شاعیر لە بەخۆدا چوونەوە و بیرکردنەوەیدا لە خۆی و لە دژوارییەکان. لەو کاتەدا شیعرێکی وەك نوقڵانەی خۆشەویستی و باران ئەنووسێ. ئەم شیعرە وەك ئەوەی پێشوو جیهانی منالانی دێتە ناو و بەوانەوە ئەبەستێ و ڕەوتی لەگەڵ ئەکات. بڕوانە تینی برووسکەی ئەو بیرەی بە گەشی بۆ وردیلەکان و دواڕۆژی مرۆڤ تەواو بوونی خۆی لەم دێڕانەدا ئەتوێنێتەوە.

- هۆنراوەکەم کلۆمێکە
دەروازەی شاری گریانتان
بۆ دائەخا
کلیلێکە
دەرگای شاری
نان و گوڵ و بەهارتان بۆ ئەکاتەوە.
وردیلەینە
هۆنراوەکەم بارانێکە
تەپ و تۆزی
سەر ڕوومەتی دێیەکەمان
ئەشواتەوە-

ئێستا پێویستە بێینە سەر ئەوەی بزانین ئاخۆ ئەو جوانییانەی دیاردە و کێشەی سەختی ژیانن چۆن دێتە شیعرەکانی ئەنوەرەوە؟ وە چۆن ڕێگای خۆیان ئەدۆزنەوە و تێکەڵ

بەژیانی مرۆڤ نەبن؟ خۆ ئەگەر ئەو جوانییانە کە خۆیان ڕواڵەت وە ناوەڕۆکیش بریتی بوونایە لە کۆمەڵێ کاریگەری کاتی و هەڵچوونی دەروونی و بنچ بەست بوونایە بەکاتێکی دیاریکراوەوە وەك هەمان پێناسەی -ئیفلاتون- بۆ جوانی ئەمانەوە. کە دروست ئەبێ و گەشە ئەکات و لە پاشدا ئەژاکێت. تەنانەت پێشبینیی ئێمە لە هەندێ جێگەی ئەم نووسینەدا ئەوە بوو کە شاعیر هەر لە چوارچێوەی دەست پێکردن و گۆڕانە وردەکانی خۆیدا ئامێنێتەوە و پێش ئەکەوێ. بگرە هەندێ لەو بیروڕا ئایدیالیستانەش کە لەملاو لەولاوە خۆیان لە شیعرەکانی ئەودا و گەلێ جاریش هۆی پێکهێنانی جۆرە ڕوانینێکی ڕەشبینانە بوون ئەبینین لەو بەرەوپێش چوونەدا لە خەنجەر و خۆشەویستیدا ئەبێ و هۆنراوەیەکی چەپرەوانە و خەست چڕ ئەبنەوە بۆ ئاسمانی پان و بەرین و ئەستێرەکانی ئاوات و دوا ڕۆژی نان و گوڵ باڵ ئەکەنەوە

- دڵی پاکی شاعیرێ درابوە بەر خەنجەر

زامەکانی بوبوونە هۆنراوەی چەپرەوانە

وە ئەبێ تەنها شاهێدی بوونی ئەم ڕاستییە لە (خەنجەر و خۆشەویستیدا ئەربکەوێ بەڵکو لە - گوڵسورخی- پێش ئەویشدا و لەگەڵێ شیعری تریشدا ئەئوەر ئەیەوێ کانیاوی هۆنراوەی چەپرەوانە لە ناخی توانای شاعیرانەیدا بتەقێتەوە. لە گوڵسورخیدا جوانی ئەبێ بەدوو بەشەوە دوو دەنگ وتووێژێك لە نێوانیاندا دروست ئەکەن. کێ پرسیار ئەکات و ڕائەمێنێ کێ هەقیقەت شی ئەکاتەوە، لە هەلومەرجی تێکۆشان و بیری پێشکەوتنخوازانەوە تەقینەوەی نوێ و جوانییەکانی دنیای شۆڕشگێڕی ئاگاداری ئەکاتەوە. لە پاش ئەمە ئەتوانین بڵێین لە سەراپای شیعرەکانی ئەئوەردا جوانی وەك مەوزووعێکی تایبەتی و تێهەڵکێش بە کۆمەڵێ ڕواڵەت و بابەتی ژیانی کۆمەلایەتی و بیری نەتەوایەتی و پێشکەوتنخوازانە دەرئەکەون. لە یەك جێگەدا ناوەستێ و باوەشی هەقیقەت بۆ بەسەرهات و لێکدانەوە وردەکان و مرۆڤایەتی ئەگرنەوەو قووڵتر لە مەسەلەی نەتەوایەتی خۆی و کێشەی فراوانەکانی جیهان ئەڕوانێت:

-بەناو سنگی ئەوانەدا پەخش ئەبمەوە

مردنیان ئەکرمە پێیان

کۆچی زەرد لە تەمی دڵیانا ئەخەم

کێڵگە و کۆخت و گولاڵە و کەژ

بۆ خەوی زڕاویان ئەبەم
ئەیمە باران و سیەینێ
بەسەر لوتکەدا دائەکەم

جوانی لای شاعیر خاك و خۆشەویستی و مرۆڤە- تیشکی ئاڵتوونی و ئافرەت و خەم فرمێسکە- وردیلانی دێیەکەی و مەرگ و ئاوازەکانی -پۆل ڕۆبسن-ە- جوانی لە مانا فەلسەفەیەکەی نزیك ئەکاتەوە ئەم پەیڕەوکار و شوێن پێ هەڵگرییە لە خۆیەوە دەست پێ ئەکات و لە پاشدا ئەچێتە ناو کۆمەڵ و کێشە ورد و گەورەکانییەوە هەوڵی تێپەڕین ئەدات چ لە واقیعێکدا کە یاخیبوون و تێپەڕین هەروا کارێکی ئاسان نییە و ئامادەیی تەواوی ئەوێ- لە خوێندنەوەی زریاندا هەست ئەکەیت بەداهێنانی زۆر و تیشکەکانی جوانی لە هەموو ڕەنگ و سەرچاوەیەکی خاوێن. هەر لەم ڕێگایەوە لە زریاندا ئامادەبوون و دروستبوون دێتە پێشەوە و تیشکی هەقپەرستی و یاسای مرۆڤایەتی پەخش ئەبن و ئازایانە وەك شاعیرێکی هاوچەرخی ئەو بەسەرهاتانەی هەموومان ئەگرێتەوە و زۆربەیان لە ناخەوە ئەمان هەژێنن و بەرەو زۆر جێگای دیار و نادیار ئەمان بەن لەوێدا جارێکی تریش بەزیاندا ئەچینەوە بەرەو گەلێ هەڵوێستی نوێ ئەبێتەوە ئەمەیە نرخ و چۆنیەتی لەو شیعرانەدا کە ئێمە لەم سەردەمەدا لە هەستی ناسك و لێکدانەوەی هۆشیارانەی ئەواندا پێویستمانە.

تێبینی:

شیعرەکان کە بەنموونە لە نووسینەکەدا هێنراوەتەوە لە -زریان- دا هەن.

سەرچاوەکان:

١- الازهار تورق داخل الصاعقة -حسين مردان-
٢- موجز تاريخ النظريات الجمالية-م. اوفسيانيكوف
٣- بەهەشت و یادگار و فرمێسك و هونەر -گۆران- ز- سمير نوفا ص٤٣
٤- لاوك و پەیام -گۆران-
٥- المادية التاريخية- ص٥١٧
٦- رسالة ذات بعد واحد -حسين مردان
٧- بحث في علم الجمال -جان برتلمي -ترجمة- الدكتور انور عبدالعزيز-ص٤٤٩.

# ونبوون و دۆزینەوە لە گێژاوی -زریان- دا

*(لە ناو شانەی شیعرەکانما*

*مەنگوینێکی سپی ڕەها ئەڕژێنن*

*ڕووناکترە لە ئاوێنەی ئاسمان*

*ئەستێرە شایی تیا ئەکا و قرمێسک ئەپکا بەچراخان)*

(لە ناحیەی عەربەتی نزیك سلێمانی لە تەمووزی ١٩٤٨دا لە خێزانێکی ئاینی لە دایك بووم، جیهانی منالّیم جیهانێکی جوان بوو- پڕبوو لە خۆشی و خەم و هەستکردنی سەیر، لە بیری سۆفییانەی باوکمەوە پاکی و بێ تاوانی فێربووم، وە لە هەڵوێستی کۆمەلاتیشەوە خۆشەویستی ولات و خۆشەویستی هەژارەکان و وەستان لەبەرەی زۆرلێکراواندا فێربووم)(١). لە پاش ئەمە ئەنوەر باسی سەردەمی منداڵی خۆی و چۆنێتی مەزاج و هەڵکەوتنی سایکۆلۆژیی خۆی ئەکات. جیاوازییەك نیشان ئەدات لە نێوان ژیان لە عەربەت و ژیان لە سلێمانیدا بەمانا ناوچەیی و بچووکەکە بەلام ئەمە لە پەنجەرەیەکی ترەوە تەماشای ئەکرێ حیسابێکی وردتر لەو حەز کردنەی ئەوی بۆ ئەکرێ. وەك خۆی وتی سەرەتای پەروەردەبوون و شارەزایی یەکەمی لە ژیان لە خێزانێکی ئاینییەوە دەست پێ دەکات و تێکەڵ بەلێکدانەوەیەکی ڕۆمانتیکی ئەبێت - واتە تەماشاکردنی ژیان بەچاوی (سۆفییەکی ڕۆمانتیکییەوە) ئەمە هیچ سەیر نییە چونکە ئەگەر لە هیچ ڕوویەکی ترەوە سۆفیگەری لەگەڵ ڕۆمانتیکییەتدا یەك نەگرێتەوە ئەوا لە شیعردا ئەبن بەیەك و چەندەها وێنەی جوان و پەلکە زێڕینە دەنەخشێنن... تیشکە وردەکان نزیك ئەبنەوە لەگەڵ خۆیاندا فەیز و نووری خوا ئەڕژێننە دڵەوە لە جوانی ڕووی نازیز و کالای ڕەنگین و شاگوڵی باخە سەوزەکانی دنیاوە کەژاوەی ڕەحمەت و خۆ بەدەستەوەدانی سۆفییانە ئەبێت بە چۆلەکەیەکی نوورانی فرە فڕ بەدەوری ڕۆحی ئەو عاشقە بێ پەروایەدا ئەکەوێتە هەڵفڕودافڕ:

(ئەو دڵەی وێنەی پەڕی گوڵ بێ گەرد
هەی خەم هەی نامەرد چەنیت مەلول کەرد
ئەوسا ئیستغنا و قین وەهەم ماوەرد
ئینسان بێ پەروا گیان تەسلیم مەکەرد

ئیسە بۆ ئەوی تاو هەرس چۆن سەیلە
ئەی ئیلتیفاتەو ئەی وەفا مەیلە
ئەی دڵەی نازك خەستەی خەمانە
گۆشت دەرو بژنە و ئەمجا بمانە)[٢]

بۆیە سەرەتا نموونەم بە(مەولەوی) هێنایەوە چونکی ئەو یەکگیرییەی لە نێوان هەندێك بابەتی شیعری ئەنوەر و کێشەی سۆفیگەری بەرچاو ئەکەوێت- هەر لە ڕۆژەکانی هەڵچوونی گیانی ئەو وە سەراپای ژیانی شاعیریەتی ئەو. ئەگەرچی من لای خۆمەوە هەر لەم نووسینەدا ڕوونی ئەکەمەوە کە هەستی سۆفیزمانە لە شیعری ئەنوەردا تەنها تاڵە تیشکێکی باریك و تیژڕەوە لە ساتە شیعرییەکانیدا خۆیان لە ئەمامی سەوزی تازە هەڵچووی واتا شیعرییەکانی ئەپێچن و هێننە نابات ئەو گرژی و توند خۆ ئاڵاندنەیان خاو ئەبێتەوە تیشکەکە ون ئەبێتەوە، هەر بەپێی لێکۆڵینەوەکە ئەوە ئەسەلمێنین کە دیاریکردنی هێڵی ڕێبازی سۆفیزمی تەنها لەبەرەی خەیاڵ و باری واقیعە تاڵەکانی ناو شیعری شاعیردا ئەوەستن و هەر هەموویان لەسەر زەمینەیەکی ڕۆمانتیکی وەستاون و ڕێچکەیان بەستووە. خوێنەریش لەوە ئاگادار ئەکەمەوە کە ناونیشانی باسەکەی من لە ونبوون و ئینجا دۆزینەوەدا نییە یاخۆ دۆزینەوە ئینجا ونبوون.

چونکە هەندێك دیاردە و ناوەڕۆکی ژیان هەیە ناتوانرێت بە هێڵێکی زەق لە نێوان لەشیاندا کەرت و پارچە جوێ بکرێتەوە. یەکێك لە دیاردە و ناوەڕۆکەکانی ژیانیش کە بەتەعبیر لێکردنێکی ویژدانی و بیرێکی تایبەتی دێتەدی بریتییە لە شیعر. ئەمەش بەهەرحاڵ - بەلام کام شیعر؟ شیعر بەواتا پڕ بەپڕی شیعر یاخود شتی تر- چونکە شیعر هەیە و شتی تریش هەیە زۆرجار ناوی شیعری لێ ئەنێن. بۆ نزیککردنەوەی مەبەستەکانمان کە باس لە شیعری ئەنوەر ئەکرێت، ئەبێت بوترێت خوێنەری تایبەتی شیعری ئەنوەر چونکە لەوەدا کە شیعری باش لە دەست هەموو کەس نایەت، تێگەیشتنیشی وەك پێویست کاری هەموو خوێنەرێك نییە.

ئینجا ونبوون و دۆزینەوەکە لای من یەکن -جوێ نین- ئەویش مانای زانستی خۆی لە گەردووندا ئەبەخشێت - چونکە ونبوونی هیچ شتێك نەمانی نییە بەڵکو گۆڕینێتی لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر. هەروەها دۆزینەوەیش مانای خەڵقکردن نییە بەڵکو بارێکی نوێ و ئەنجامی ڕێکەوت یاخود تێکۆشانی بەردەوامە لێرەدا ئەو شتانەی لای ئەنوەر ون ئەبن مانای لەناوچوونیان نییە - ئەشێت لە هەر ساتێکدا لە تێپەڕینی شیعریی ئەودا چەند

ونبوون و دۆزینەوە ڕوویدات. دژوارییەکان خەست ئەبنەوە تەمەکان چڕ ئەبن، ژیانیش گەلێك ڕواڵەت و ناوەڕۆك بەسەریەکدا ئەشێوێنێت گەلێکی تریش ڕێك ئەخاتەوە بۆ هەنگاوی پاش نوێکردنەوەکە ئامادەی ئەکات. هەیە هەر زوو ئەبێت بە شاعیر! نەك بەدیوانێك و دووان بگرە بە شیعرێك بە دوو شیعر! هی واش هەیە هەتا ئەمرێت هەر بە شاعیر نابێت -گۆران- تەنیا جوانی بێ ناو و زیندانی ئەژدەهاك و شەهیدی بوتایە ئەگەریش نەبوایەتە ئەم -گۆران-ەی ئێستا هەر ئەبوو بە شاعیر و جێگەی خۆی لە شیعری کوردیدا ئەگرت.

لەو کاتەوە بەتایبەتی هەر لە سەرەتای حەفتاوە شیعر وەك لێزمەی بارانێکی بەهاریی شەستە و ڕەهێڵەی بەسەر خاکی لە نوێ ژیاوەی وڵاتدا بەرپا ئەکرد.

گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان بەتایبەتی -هاوکاری- بوویووە مینبەرێکی ئەو بەخۆدا هاتن و لێشاوە ئەدەبییە. وەك دیاریشە شیعر لە ڕیزەکانی پێشەوە دابوو. ئەم شەپۆلە ئەنجام لە کەنارێکدا نارام بووەوە. بەجۆرێك توانرا شیعری باش و خراپ لەو مەیدانی گوڕهاتنە پێشەوەیەدا جوێ بکرێتەوە هەندێك هەبوون پێشتر شیعریان خۆی فەرز کردبوو. هەر بەڕاستیش شاعیربوون لەو تەقینەوەیەشدا هەر بەشاعیری مانەوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ -شیعر لە دوای شیعر قووڵ ئەبوونەوە بەناخی دەروونی ڕەسەنیەتی و تەکنیکی هاوچەرخانەدا ڕۆ ئەچوون شتی باشیان پێشکەش بەو خەڵکە و بەئەدەبی کوردی ئەکرد. لەوانە - حەمە سالح دیلان و کامەران موکری و ع.ح.ب و شێرکۆ بێ کەس و جەمال شارباژێری و عەبدوڵڵا پەشێو. بەڵام لە پاشدا هەندێکیان نەیانتوانی هاوشانی پێشەوەچوونی تەکنیکی نوێ و باری واقیعی شیعر و ژیانی واقی میللەتەکە ڕێگە بگرنەبەر. بۆیە لە جێگەی خۆیان وەستان ئەوەش کە ئەیان نووسی بەهیچ جۆرێك تێپەڕینێکی تێدا نەبوو، چ لە شیعری خۆیان و شاعیریەتیان، چ لە ناوچەیی و عالەمی شیعردا. کەچی هەندێکی کەیان وەك شێرکۆ و جەمال و عەبدوڵڵا پەشێو- بەردەوامییان مسۆگەر کردو لە تاقیکردنەوەکانی خۆیان و ئەدەبی گەلانی کەوە دنیایەکی نوێی شیعری کوردییان دروست کرد.

ئەنجا لەو گەرمەی بەخۆدا هاتنەوە شیعرییەی پاش حەفتاوە ئەنوەر یەکێك بوو لەو شاعیرانە، لە ساڵی ١٩٧٢ بە ساڵی- بەرهەم بڵاوکردنەوە و ناسینی ئەنوەر دائەنرێت. هەر لە شیعری -پشکۆکانی ناخمەوە- هەتا ئەگاتە -بەدەرە دەست سەرما و سۆڵە- زیاتر ڕەوتی بەرەو پێشەوە چوون و دیاریکردنی دەنگی تایبەتی بۆ شاعیر مسۆگەر ئەکەن.

لەوێوە ئەتوانین پەنجە لەسەر لایەنە سەرکەوتووەکانی شیعرەکانی دانێین و بڵێین – ئەم شیعرەی لەو دیاردەیەدا بریتییە لە تێپەڕین– و لەو لایەنەشەوە زیرەکانە کێشەکانی بەپێی مۆسیقایەکی هێمن یان تووڕە دابەش کراو– یاخود فلان تەکنیکی شیعری و ڕەمز و قناع– بەموڵکی خۆی و لێ هاتوویی و سەلیقەی شیعریی خۆی دائەنرێت. دنیای شیعری ئەنوەر بەوە دێتە پێش چاوم کە لە دوورەوە تەمێکی ڕەنگا و ڕەنگ دەرئەکەوێت وردە وردە نزیک ئەبێتەوە، لەگەڵ نزیکبوونەوەکەشیدا خەست و چڕ ببێتەوە منیش لە بەرانبەری پێ دەشتێکی بەریندا وەستابم. کات بەرەبەیان بێت و تەمە خەستەکە ڕەنگێکی سپی شیری بگرێتە خۆ و بەسەراپای دەشتەکەوە پەخش بێت، ناو بەناو لە هەندێك جێگەدا تەمە هەرە سپییەکە تەنك ئەبێتەوە و هێندەی ئەو دەلاقەیە دەشتەکەم لێوە دەرکەوێت. ببینم لەو ئاستەدا بزووتن و جووڵەیەك هەیە – گرنگ ئەوەیە هەموو شتێکی جووڵە و بزواندنەکە نەبینم تەنیا هەست بکەم هەیە. ئەم حاڵەت و بینینەش ئەگەر لە یەکەم شیعریەوە نەیەتە دی ئەوا ئەتوانین بڵێین شیعری – زیندە خەو و تارماییەکان – بریتییە لە سەرەتاکەی.

(هێندە ڕوانیم هێندە ڕوانیم
هەموو جیهان لەناو چاوما ئەخولێتەوە
بوونم تۆپەڵە بەفرێکە
لەناو لەپی کرێوەدا
هەموو ڕۆژێ بەسەدان جار
ئەیبەستێت و ئەتوێتەوە)

ئەم هەڵچوون و داچوونە ئەبنە پێشەکیی دۆزینەوە و ونبوون، ئینجا دۆزینەوە – کەچی پێش ئەم شیعرە لای ئەنوەر شیعر نابێتە کشانی تیشکە ڕۆحی و باڵندە سپی و نوورانییەکانی فریشتەکان.

خاك تێکەڵ بەخۆشەویستی ئەبێت و شتە گشتی و کەرەسە تەقلیدییەکانی ئەو شەپۆلە شیعرییەوە کاری دنیا شیعرییەکەی دەوروپشتی لەمیشدا دەرئەکەوێت. ئەو شیعرەی چەند ڕستەیەکم لە سەرەوە بەنموونە هێناوە ئەوەندە جیاوازە لەگەڵ شیعری – پشکۆکانی ناخم –و لە جانتای پۆستەرێکی شاری گریانا – و گیانەلاوی گەشتێکدا – کە ئەشێت بڵێین هەتا ئەوێ دەنگی ئەنوەر دەنگێکی خەڵکی تر و شتە عادەتی و باوەکانی تریش بوون. بەلام لەو شیعرەوە – زیندەخەو– ئەگەر سنوور بێت ئەوا شاعیر بەدوای دەنگی

خۆیدا ئەگەڕێت و لە ونبوون و دۆزینەوەکاندا مامەڵە لەگەڵ شیعری ڕەسەنی دەست و سەلیقە و وەستایەتی شاعیرانەی خۆی ئەکات.

لە -پشکۆکانی ناخم-دا وەك وتم شتی (عادەتی و مەئلووف) و دەنگی باو و خەڵکی تریش تێکەڵ دەبن - ئەویش لەگەڵ (باو)ەکاندا ئەڵێت:

(کزەبای کێوی ژانی تاڵ
گەڵای زەردی وەریوی گیان
ئەورووژێنێ
تەمی چاوی هۆنراوەکانی
پرشنگی سوور ئەتاسێنێ)

بەم جۆرە قافیەکان دێنە خوارەوە (ئەورووژێنێ، ئەتاسێنێ - ئەمرێنێ، ئەبارێنێ، ئەپچڕێنێ)، شیعری -لە جانتای پۆستەرێکی شاری گریاندا-و گیانەڵاوی گەشتێکدا- هەمان دووبارەبوونەوەی تێدایە (هێلانەمە، هەناسەمە، هەوارمە، مەرامەمە، ئەسووتێنم، ئەخولقێنم)، (شەیدایەکەم، لاوێکەم، گریانە، بارانە، بتارێنێ، بشڵەقێنێ، ئەتوێتەوە، ئەکوژێتەوە، ئەهژێنێ، ئەنەخشێنێ) ئەمە وەك عادەت و تەقلیدی بەکارهێنانی قافیە و هێشتا شارەزا نەبوونی لە بەکارهێنانی مۆسیقا و ئیقاعی ناوەوەی شیعر-ی وشەکان- لەو شیعرانەدا ئەتوانین بڵێین:- کزەبا گەڵا ناووروژێنێ بەڵکو ڕەشەبا گەڵا ئەوەرێنێ بەڵکو سروشتی ناسایی پاییز و گۆرانی دۆخی وەرزەکە ئەمە ئەکات.

نازانم مەبەست لەم واتایانە چییە (پشکۆی چاوەکانم ئەمەییون، بەرەو وڵاتی ئەبوونتان هەنگاو ئەنێم، لە خەو و خەیاڵی مردووم، گیان و بوونم ئەخولقێنم، باوەشی چڵکنی شار، جەرگی جەستەی چاوەڕوانی، بەفری تینوو، چاوی مەییوی ئاسمان چاوی هۆنراوەکان، کزە بای کێوی ژانی تاڵ، دڕکی خەم، کفنی گۆڕستانی تاری ناو دڵم، چاوی مردن تێر خەو ئەکەم، دەنووکی واشەی ژانی تاڵ، شەو ئەمرێ،) ئەم واتایانەی سەردەمێکی زۆر لە شیعری کوردیی ئەو کاتە بووبووە باو، گەلێك جار شاعیر خۆی بەدەلالاتی جیا و مەبەستی ناوەوەی خۆی ئەمەی ئەکرد.

ئەشێت هەندێکیان هەر بەڕاست وەك چاو بەستێك و مژدەی شیعر ئەو واتایانەیان دانابێت: خۆشیان نەیانزانیبێت چی دەبەخشێت و، لە پێناوی کام مەبەستا بەکاریان هێناوە بۆیە ئێمە لە بەرامبەر ئەم کێشەیەدا بەگومانەوە ئەوەستین. ئەو جۆرە مژدەیەش

له سەرەتاوە تۆوی مەرگی خۆی هەڵگرتبوو. گەر وەها نەبووایە وا بەزوویی نەئەبووە هەڵم و لە چاو ون نەئەبوو. هەروەها وەك هەمان دەستووری زۆربەی شیعرەکان بەوشەی خۆشەویستم دەستی پێ ئەکرد. ئەنوەریش ئەو دەستوورەی ڕەچاو کردووە و لێی تەریك نەبووە:

(خۆشەویستم
دڵمان هەر چوار وەرزەکەی زستانە)
(خۆشەویستم
کاسەی سووری چاوانی من...)
(خۆشەویستم
زۆر دەمێکە دەنووکی واشەی ژانی تاڵ)
(خۆشەویستم
کاتی لێوی بەفری سپی شەیدا لە دوور...)

لە کۆتایی شیعری (هەموو دڵداری بەیان و نانین)دا شاعیر بەپەراوێزی ڕوونکردنەوەیەك لە بارەی شیعرەکەیەوە ئەنووسێت (هەوڵێکە بۆ بەکارهێنانی دوو جۆر کێشی تازە لە شیعری نوێدا) ئەو بڕیارە پێویستی بە لێ وردبوونەوە و شیکردنەوە هەیە. شاعیر ئەڵێت: هەوڵێکە - واتە هێشتا هەر هەوڵە و لە تاقیکردنەوەدایە بەڵام دەبووا لە پاش هەوڵی ئەو شیعرەوە زیاتر هەوڵەکە چەسپ بووایە و کێشەکە لە تاقیکردنەوە تێپەڕییایە. دیارە لە ڕێچکەی شیعرەکاندا ئەو شیعرە شازە و لەوانی کەدا هیچ هەوڵێك بۆ دۆزینەوە و بەکارهێنانی هیچ کێشێك نەدراوە.

ئەگەر بەم پێیە بووایە پێویست بوو شیعری (بەدەم دەست سەرما و سۆڵە و سۆناتەی تینوویەتی و وەرە خوارێ)یش زیاتر پەراوێزی بۆ دروست بکرایە و بڕیاری لەو جۆرەی بەسەردا بدرایە.

تەنانەت وەك تەکنیك و گوڕ و هێزی شیعریش ئەو شیعرە - هەموو دڵداری بەیان و نانین - ناگاتە ئەو سێ شیعرەی ناوم هێنان. جگە لە دابەشکردنی مۆسیقاکەی و گرنگی و گوێدان بکەین ئەم ١٩٧٣یە و ئەوانیش، ١٩٧٥، ١٩٧٦، ١٩٧٧ ئەبن بە ساڵی نووسینیان واتە ئەو چەند ساڵەی ئەکەوێتە ئەو نێوانەوە هی پێشەوە چوون و خەستبوونەوە و تاقیکردنەوەیەکی کەی تیادا نەبووە؟!

بەشی یەکەمی شیعرەکە بەواتایەکی چوار بڕگەیی دەست پێ ئەکاتەوە. سەگ وەڕ

گەرمە –لە دێڕی یەکەم و دووەم و سێیەمدا کێشی (١٤) بڕگە بەکار هاتووە٧+٧=١٤، دێڕی چوارەم کێشی حەوت بڕگە دووبارە ئەبێتەوە جگە لە ئوسلووبی تەقلیدیی– جووت قافیە– وەك –ونبوونن، دەروونن، هەتا دەگاتە نایەهژێنێ، ئەیبڕژێنێ، لە بەشی دووەمی شیعرەکەشدا هەردوو دێڕی– جێگای سارد تەزیوما نوقمی دەریای دڕکەزیم–و جێگای سارد و تەزیوما بەندەریێ هەیە بیبینم) کێشی هەشت بڕگەیین بەهەردوو ئەبن بە ٨+٨=١٦ واتە هەردوو کێشەکە ١٤ بڕگەیی و ١٦ بڕگەیین و لە زۆر شیعری کوردیدا بەکارهاتووە.

بەڵام سەرەڕای ئەم ڕووە کلاسیکی و دووبارەبوونەوەی دەنگە شیعرییانەی تێکەڵ بە کەسانی تریش ئەبن، شاعیر توانیویەتی لە لایەکی کەوە خۆی بگرێتەوە و لەم کۆسپە دەرباز بێت و بەهەوڵێکی شاعیرانە و گەشبینییەکی مرۆڤانەوە وەك کوردێکی خاوەن باوەڕ ورەی بەرز لە ژیان و دوا ڕۆژی میللەتەکەی ئەڕوانێت – زۆر لەو شەپۆلە ڕەشبین و بێز لێکەرەوە و کەم ئەفەسانەی بەسەر دەنگەکانی کەدا ئەهاتن زۆر بەدەگمەن ئەم ئەگرێتەوە – ئەو کاتەش دژوارییەکانی ڕووی کۆمەڵایەتی گردبوونەوەی لە کێشەی نەتەوایەتیدا بەجۆرێك بوو کە مرۆڤ ئەگەر ئاگاداری خۆی نەبوایە و بەچاوێکی گەش و بیرێکی زانستییانەوە تەماشای گۆڕانکارییەکانی نەتەوەکەی نەکردایە بێ گومان تووشی ڕەشبینی و خۆ لە دەستچوون ئەبوو – نموونەی ئەو ڕووناکییە تەنانەت لەو چەند پارچە شیعرە سەرەتاییەشدا دەرئەکەون:

(لەجێی خورەی ڕووبارێکی شین و هێمن
شەپۆلی دەریایەکی شێت و شەیدا بێنێ)
(وەکو هیوام، شەوی ژان و نا ئومێدیم
ئەسووتێنم)
(من پەیامی خۆشەویستم)
(وێنەی من بەخامەی قوڵنگ کێشراوە
ڕووبارێکە کە ئەڕژێتە دەشتی تینوویەتی دنیاوە)
(فەرهاد زوو کە
ئەمی خەستی گڵێنەمان بڕەوێنە
قوڵنگەکەت بوەشێنە
تاوێڕی بێستوون برمێنە)

(حەمدی) دەڵێت:

«سویح بێ ناکەنێ تابی نەوایێ شەو بەدڵ نەگری
گوڵێ ناپشکوێ تا بولبولی سوبحێ بەکوڵ نەگری
بەری نابێ درەختی باخی عالەم هەتا هەموو وەك
یەك بەیەك سۆز و بەیەك شۆر و بەیەك دەم چڵ بەچڵ نەگرێ»[٣]

لە حەمدیش نزیکتر بڕوانین (گۆران) لە هەمووان بە سەلیقە و وەستایانەتر بۆ بەکارهێنانی گریان چووە. لە -هەوری پایز- دا ئەمەی (گۆران) و ئەوی حەمدی و ئەوی ئەنوەر هەرسێکیان یەك ئەگرنەوە یەك مەبەستیان هەیە لە ڕووکردنە بەکارهێنانی گریان وەك ئەنجامی نازارێکی سەخت و دەربڕینی قین و ئەو نیازە خاوێنانەی لە دەروونی مرۆڤدا پەنگیان خواردووەتەوە و تاساون.

(بەسەر پایزی زەردا با بەخوڕ بگری بەکوڵ بگری
لەسەر ئاخر گەڵا ئاخر چڵی تەنیایی گوڵ بگری
بەخوڕ بگری بەکوڵ بگری بەسەر دەشت و دەری وشکا
بەسەر داری گەڵا زەرداو بەسەر پووشا بەسەر دڕکا)

هەتا ئەڵێت:

«بەڵێ بگری هەور بارانی پایز بێ وچان بگری
لەسەر باخچەی گوڵێ وا سیس ئەبێ ئاخر چڵی عومری[٤])

هاوکێشەکان لە هەر سێ نموونەدا بەم جۆرەن: (سوبح بێ ناکەنێ -گوڵ ناپشکوێ- بەری نابێ درەختی باخی عالەم- هەتا بێ نەوایەك و بولبولێك و ئەوانی تریش هەموو وەك یەك نەگرین.)

لای (گۆران)یش (بەسەر پایزی زەردا- بەسەر دەشت و دەری وشکا - بەسەر داری گەڵازەردا - بەسەر پووشا، بەسەر دڕکا... هتد. هەوری پایز با بەخوڕ بەکوڵ بەسەر هەموو ئەوانە و زۆری کەمشدا بگری گریان لای گۆران ئەومیە هاوین و وشکایی تەواوی خستووەتە سروشتەوە. سروشت کە ڕەمزی زیندوویێتی و جوانییە تینووە و چاوەڕێی بارانێکە - هەوری پایز نموونەی خێرە لە باراندا دا ئەکات. ژیان و بووژانەوە سەرلەنوێ بەسروشت ئەبەخشێتەوە، کاریگەری (حەمدی) یان (گۆران)ی لەسەرە، تەنانەت زۆرجار هەندێك شت لە -لاشعور-دا دێنە پێشەوە و ڕوو ئەدەن یاخود گەرمی و گێژەنی خودە

شیعری و ساتە گەرمەکانی هێنندە کەم دەرفەت و کاریگەرن، ماوە نادەن بەشاعیر هەندێك لەسەریان بوەستێت و یەکالایان بکاتەوە. هەر ئەمەشە بوو هۆی بەسەردا تێپەڕینی ئەنوەر بەسەر تەنسیری (حەمدی) و (گۆران)دا. سەرەڕای ئەمەش هەر ئەبووایە خوێنەری ئاگادار بکردایەوە لە پاش پێداچوونەوەی شیعرەکەی. شاعیر گریانەکەی بۆ لە دایکبوونێکی وەها ئەوێت کە بتوانێت بەرەنگارییەکی ئازایانەی ئەو هەموو دژواری و شتە بێهوودەیی و ڕەشبینی و تێشکانی شاعیر لە هەندێك شیعریدا ئەم جۆرە هەڵوێستانەی لە وێنەی تری شیعرەکانیدا وەك -خاك و ژیان-ە بەدی ئەکرێت توانیویەتی تیشکێك بهاوێتە ئەو تاریکیانەوە.

گەلێك جار فۆلکلۆر ئەبێتە مایەی دروستبوون و پەیدابوونی گەلێك بەرهەمی هاوچەرخ و سەرکەوتوو، ئەمەش پەیوەندیی بەوێژدانی مێژوویی هەموو نەتەوەیەکەوە هەیە و سیفات و خاسیەتی- فۆلکلۆر و کەلەپووری نەتەوایەتی هەر نەتەوەیەك تەعبیر لە هەڵکەوتنی باری مێژوویی و قۆناغی گۆڕانی ئەکات. لە سەراپای ڕۆژهەلاتدا بەسەرهاتی عەشقی شیرین و فەرهاد لە ناو هەر سێ نەتەوەی کورد و تورك و فارسیدا دەنگی داوەتەوە. هەندێك جاریش بەشیرین و خەسرەو ناو ئەبرێت. شاعیرانی کۆنی ڕۆژهەلات لە کۆنەوە ئەو کارەساتە درامییەیان بەشیعر هۆنیوەتەوە. وەك (فیردەوسی) فارس و (شەیخی) عوسمانی و (خانای قوبادی)ی کورد. هەتا ئەگاتە (نازم حیکمەت)ی شاعیر و پێشکەوتنخوازی ئەو چەرخە لای نازم حیکمەت پاڵەوانەکان، کارەساتەکان جۆرێکی تر دروست ئەبنەوە لای نازم حیکمەت فەرهاد تەنیا عاشقێکی سادە و موڵکی شیرین نییە. فەرهاد کوڕی ڕەنج و تێکۆشانی میللەتێکە، کریکارێکی وشیارە و ئەوەندەی هی شیرینە، لەوە زیاتر موڵکی خەڵکە برسی و چەوساوەکەیە. (نازم حیکمەت بڕوای بەوە هەیە دراما تەنیا و تەنیا کارێکی هونەری ڕووت نییە کە بەتەنیا دنیا و هەست و هۆشی خۆی بگرێتەوە. ئەو نووسەرە فێرکەر و دەرس دادەر نییە کە زۆر بابەتی شانۆیی کەدا ئەیبینین. هاوکێشەیەکی لە باری بابەتەکەی بەشێوەیەکی یەك لە دوای یەکی پێشکەوتوو هەتا کۆتاییەکەی داناوە)(٥)

لای ئەنوەر – وەرزی سەرهەڵدانی فەرهاد – ئەبێتە وێنەیەکی هاوچەرخی شیرین و فەرهادی فۆلکلۆری بەلام لێرەدا کۆمەڵێك حیواری یاخود دەنگی وەك یەك و مەبەست و دەنگێکی جیاواز و دژ بەوان ئەبیسترێت. سێ دەنگەکە کە نوێنەری هێزی خێرن کۆرس و شیرین و فەرهادە، دەنگی بەرەنگاربوونەوەکەش پیرەژنە. ئەگەر کاتی خۆی شاعیر هەر

لەسەر ئەو مەیلە شیعرییە بیری لە نووسینی شانۆگەری شیعری بکردایەوە و هەمان بابەتی هەڵبژاردایە گەلێك ئەچووە پێشەوە لایەکی ئەو بۆشاییە گەورەیەی پڕ ئەکردەوە کە هەتا ئێستا لە شانۆگەریی شیعری کوردیدا هەیە. بگرە لە چەند هەوڵێکی (شێرکۆ بێ کەس) زیاتر هیچمان لەبەر دەستدا نییە. کەواتە دارشتنەکەی ئەنوەر زیاتر شیعرێکی درێژە و چوار دەنگ پێکی ئەهێنێنن، شاعیر لە پەراوێزی دوا لاپەڕەی شیعرەکەدا دەربارەی ڕەمزەکان: (تەفسیری شیرین و فەرهادەکەی نازم حیکمەتیشی تیادایە بەلام لای خۆم چ ناوەڕۆك و چ ڕوخسارەکەی جیاوازە - ئەم ڕەمزانەش وەك قناعێك لە تاقیکردنەوەیەکی تازەدا بەکارم هێناوە(٦)). لە پێشدا ئەڵێم ڕەمزیش هەر خۆی ڕەمزە و نابێتە قناع، کە بووە ئەم ئەبێتە شتێکی تر و بارودۆخێکی تر لە بەکارهێنانیدا وەرئەگرێت. نازانم شاعیر مەبەستی لە تاقیکردنەوەیەکی تازە -چییە؟. لە بارەی ناوەڕۆکەوە باسی بکەین ئەبینین شاعیر هیچ خستنە سەرێکی (اضافە) حەددی- لە کارەکەیدا نەکردووە. هەروەها جگە لە پیرەژن کە وەك بەرەمزی بەلا و دوو زمانی و شەڕ داینـاوە ئیتر هەمان بابەتی (نازم حیکمەت)ی دووبارە کردووەتەوە.

فەرهادی کرێکاری نازم لە فەرهادی تێکۆشەری ئەنوەرە لە هیچ ڕوویەکەوە جیا نابێتەوە. ئەگەر بمانەوێت خاڵەکانی جیاوازیی هەردوو دەقەکە نیشانە بکەین تەنیا ئەتوانین بڵێین:

کارەکەی نازم شانۆگەرییە و ئەوەی ئەنوەر کۆمەڵێك وتوویژ و ڕادەربڕینی چوار کەسە بە شیعر. تایبەتی هەردوو کۆپلەی کۆرس کە دووبارەی ئەکەنەوە تەواو لە قسەی ئەو پاڵەوانانە ئەچێت کە لە شانۆگەرییەکەی نازمدا فەرهاد هان ئەدەن بۆ کارکردن و ماندوو نەبوون و کۆڵ نەدان. هێزی ئەنێنە بەر و هەموو هیوا و دواڕۆژی خۆیان لە نووکی قوڵنگ و بازووی فەرهاد-دا ئەبیننەوە.

*(ئـافرەتە هـاوەن منداڵەکە - منداڵەکەی بەرز ئەکاتەوە: ڕۆڵەکەم گوێ بۆ دەنگی قوڵنگەکە ڕاگرە.*

*خەڵکەکە -بوەشێنە فەرهاد- قوڵنگەکەت بوەشێنە - تۆش ئەی ئاوی چیای ئاسن هێلاکە وەرە دەرەوە گۆزەکانمان پڕکە بوەشێنە ئەی فەرهاد- قوڵنگەکەت بوەشێنە*(٧)).

لە (وەرزی سەرهەڵدانی فەرهاد)دا بەهەمان شێوە خەڵکەکەی نازم ئەبنە کۆرس لای ئەنوەر:

(فەرهاد، فەرهاد
قوڵنگەکەت بوەشێنە
لە دڵی ڕەقی بێستوونا
بۆ شارێکی برسی و تینوو
ئاو دەربێنە- گوڵ بڕوێنە
فەرهاد، فەرهاد)

شیرین لە کارەکەی ئەنوەرا وێنەیەکی نوێیە بەڵام پیرەژن هەر کەسە فۆلکلۆرییەکەیە. شیرین لە پاڵ دەنگی کۆرسدا هاوبیر و خۆشەویستی فەرهادە بەڵام لای ناظم شیرینێکی ئەفسانییە بۆ دواجار بانگهێشتنی فەرهاد ئەکات بۆ وازهێنان لە کارەکەی و گەڕانەوە بۆ کۆشکی ئەمیرە (مەهمەنە)ی خوشکە گەورەی. فەرهاد ڕازی نابێت و قوربانی بەعیشقی خۆی ئەدات، بۆ عەشقی خەڵکی- ئەنوەر هاتووە کۆرس و شیرین و پیرەژن و فەرهادی وەك چوار ڕووپۆش (قناع) بەکارهێناوە کۆرس بەرەی خەڵکی ڕەش و ڕووت و مرۆڤەکانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵن، سەرفرازی و ئامانجی خۆیان لە دەست و بازووی فەرهاددا ئەبیننەوە فەرهاد نموونەی بیرێکی تایبەتی و مرۆڤانەیە. کەسێکی دڵسۆز بە نەتەوەکەیەتی، تینی بازوو تەمەنی خۆی، عیشقی گەورەی خۆی، ئەکاتە موڵکی ئەوان:

(باخی زڕی لێوی زەردی مناڵەکان
زەردەخەنەی شیرین ئەگرێ
ڕووباری ئاو بۆ گەرووی شار ڕێگا ئەگرێ).

پیرەژنیش نوێنەری دوو دەنگە، دەنگی کەسانی ئینتهازی و خۆفرۆش و بێ ویژدانەکانی میللەتن، هەروەها هێزی شەڕی داگیرکردن و گرتن و کوشتنە، ئەو هێزەی هەمیشە بەخوێن تینوویەتیی خۆی ئەشکێنێت و تەورێکی گەورەی بەدەستەوەیە لە دوو فەرهاد ئەگەڕێت، زۆرانبازیی لەگەڵ ئەکات. لە گەردنی بەرزی زۆر -شیرین-ی عاشق و مناڵی بێ تاوان ئەدات.

ئەنوەر هەروەك ناظم ڕەنگی دوا ڕۆژێکی گەش و پڕ لە دەستکەوت بۆ میللەت زاڵ ئەکات بەسەر ڕەنگەکانی کەدا. لە پێشکەوتنی بەردەوامی خۆیدا ناوەستێت و لە وەرزی سەرهەڵدانەوە ئەگاتە -گولسورخی-و مرا ببوس بەیەك دەنگ ئەڵێنەوە.

ئەو شیعرەی گولسورخییە لای من لە پێشەنگی سەرکەوتنە فیکری و هونەرییەکانی

ئەنومەردا جێگای خۆی ئەکاتەوە. دەست لە دەستی -نای تاتیانا-ی شەنگ-ئەنێن و لە -زریان-دا هەرگیز لە یاد ناکرێن و خۆڕاگرتنی زەمەنی شیعری و بەخۆهاتنی فیکری شیعریی شاعیر لە زەمینەیەکی فراوانتردا بنج بەست ئەکەن. ئێمە مادام باسمان لە ڕووپۆشەکان، ڕەمزی شیعری (وەرزی سەرهەڵدانی فەرهاد) کرد ئەبێت ئەو ڕەمز و ڕووپۆشانەی کەش کە شاعیر بەکاری هێناون دیاری بکەین، ئەوانەش هەریەك بەپێی دەلالەتی کاتی و جێگەیی لێکدانەوە و مەبەستی تایبەتیی خۆیان هەیە (خانی، مەم، زین، عەریەت، مەرگ، خاك، زریان، مەولەوی عەنبەر خاتوون، نووری خوا، گۆلاوە شینەکەی عەریەت، بێستوون، بەمۆ، پەلە گەنم، کۆتر، گمەی کۆتر، سیروان، نازم حیکمەت، گوڵسورخی، ڤان کوخ، پۆل ڕۆبسن، مەشخەڵان، حسەین، زرێبار، قومری سپی.) هەموو ئەو ناوانە لای ئەنومەر نیشانە و نموونەی بەرزی و خاوێنی و خۆشەویستین، هەندێك جار زیاتر لە یەکێکیان لە شیعرێکدا کۆ ئەبنەوە.

هەندێك لەو ناوانە لای زۆربەی شاعیرانی هاوچەرخی ئەم بەکارهاتوون. کەچی ئەو زیندوویێتی و بارە سروشتییەی بەکارهێنانی ئەمی تیا نابینرێن، واتە ناوێتەی خوێنی ناو دەمارەکان نابن. ئەگەرنە دڵ و لەوێشەوە بەهەموو ئەندامەکانی شیعرەکەدا بڵاونابنەوە. هەست بەپێوەلکاندن و بەئەنقەست دانانیان ناکەین بەتایبەتی، لە (گوڵسورخی)دا دەنگی شیعری ئەو و گۆرانیی (مرابیوس) دێتە گوێ بەشێك لە مێژوو کۆ ئەکاتەوە و ڕووە تاریك و ڕۆشنەکانی دیار ئەکات، زیرەکانە لەو حاڵەتەدا ئەژیەتەوە، کاتێك ڕۆژبێهیان بۆ دادگا ئەبرد و زیندانییەکان بە(مرابیوس) بەرێیان ئەکرد:

(مردن ڕێیەو ئەی یەری گیان
ئەی دامۆن گیان
دڵگیر مەبن پیایا ئەڕۆم
تا لە دوورگەی دووری بەیان
گوڵاڵە و نان بۆ ملیۆنان -دامۆن- بێنم
مردن ڕێیە و ئەچم ئەخشەی شەنگ و تازەی
نیشتمانی غەریبانی لێ ئەهێنم).

بینین و هەستکردن بەتارمایی مەرگ لە نزیکبوونەوەی شاعیردا هەست پێ ئەکرێت لە ئەدەبیاتی فارسی. بەتایبەتی (فەروخی فەروخزاد). لایەنەکانی ڕەشبینی و ورەبەردان، پەنا بردن بۆ شەو و تەنیایی لەو ئەدەبەدا توانیویەتی دەوری ڕەشبینیی خۆی لە

شیعرەکانیدا بنوێنێت. ئەگەرچی ئەو ڕەشبینی و هەست بە لەدەستچوون و بەجێ هێشتنە نەك بۆ ئەم بەڵگە بۆ زۆر شاعیری تریش ئەبنە مایەی داهێنان و پێزی شیعریان. بەڵام بەگشتی لە ڕانەی (شیعر لە پێناوی مرۆڤ)دا شیعر دێننە خوارەوە و تووشی کەند و کۆسپی ئەکەن. شاعیری وا هەیە هەموو مەینەتی و تاریکییەکانی ژیانی خۆی بۆ ئەبێتە مایەی گەشبینی و تەماشا کردنی جیهان و پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانی بەوپەڕی بڕوابوون و هیوای گۆڕینی بۆ بارێکی باشتر. من لەوە دڵنیام ئەگەر فارسی زانێکی باش بوومایە و شارەزاییم لە ئەدەبیاتی نوێی فارسی بوویبووایە باشتر و قووڵتر ئەمتوانی بۆ هەندێك لایەنەکانی شیعری ئەنوەر بچم. ئەمەش ئێستا لێی بەئاگاین ئەنجامی ئەو چەند گۆڕینانەن لە جارویار شاعیر خۆی هەندێك برادەری تر ئەیکەن. بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو حاڵەتە تاریکییە مەرجی سەرەکی، کە بڕبڕەی پشتی بەردەوامی و گەشبینییە بوونی فەلسەفەیەکی گەشبین و گەشبینییەکەیە بوونی فەلسەفەیەکی گەشبین و فراوان و قووڵە لە ژیاندا. لەم ڕووەوە ئەتوانین ژیانی (نازم حیکمەت) و هێزی پڕ لە هیوای ئەو بەراورد بکەین. کە ئەبووایە بەپێی ژیانی زاتیی خۆی و ئەو هەموو بەندی و دەرکردن و نامۆیی و کارەساتە دڵتەزێنان ڕۆژێك لە ڕۆژان شیعرێکی ئەوتایە کە هێندەی تاریکایی لە زیندانەکانی جیهاندا هەیە ئەوەندەش ڕووناکی لە دڵی ئەمدا مژدەی بەئامانج گەیشتنی بدەنێ بەپێچەوانەی ئەمەوە ئەگەر شاعیرێك هەندێك جاریش لە ژێر تەئسیری (نیتشە و شۆپنهاوەر)دا خۆی ببینێتەوە، ئەمە بەتەنیا مانای تاقیکردنەوەی زاتی و تاریکایی حاڵەتی زاتیی شاعیرەکە نییە بەڵکو مانای نەبوونی فەلسەفەیەکی نوێی گەشبین و نەڕاونینە لە ژیان بەچاوی هێز و بیرێکی پێشکەوتنخوازانەوە.

(هاوڕێی هەموو هەورێ بووم
وەختێ ئەبارین
دوو سێ دڵۆپ بارانیان
بەسەر دەوەنی تینوویەتیما
نەئەباری جارێ)
(گەر شێت نەبم من لە کوێ و دەست لە ملی وڵات
کردن لە کوێ)
گەر شێت نەبم من لە کوێ و هەڵمژینی هەلالەی

لێوی -کابوول-ی یار لە کوێ)
(شەپۆلێ بووم باڵم گرت و شێت بووم
دەمم نەنایە دەمی کەنارێ)

لەو گێژاوە فیکرییەی شاعیر تیایدا نەسووڕێتەوە، گەلێك هەست و بیرکردنەوە و بۆچوونی ئایدیالستانە دێتە شیعرەکانیەوە ئەو لە دەستچوونەش لە ( کۆچی شازادە)دا تووشی هاتووە ڕەنگدانەوە و تەقینەوەی ئەو خەمناکی و کپی و بێ ئارامییەی ناخییەتی کە نەشێت ئەنجامی پەنگ خواردنەوەیەکی کاتی ڕۆژ و دووان نەبێت:

(سەر هەڵنەگرم لە وڵاتی غەریبیدا
دوور دوور لە تۆ نەچمەوە باوەشی خاك)

چوونەوە باوەشی خاك ئەوە نەگەیەنێت کە ئەم لەسەر ئەو ڕایە بێت مرۆڤ لە خاك دروست کراوە و ئینجا گیانی کراوە بەبەردا و ئادەم و حەواش باوك و دایکی هەموو کەسن. ئەو سەر هەڵگرتن و تەسلیم بوونە و بڕوابوونی بەچوونەوە بۆ ئەو خاکەی لێوەی دروست کراوە تێکەڵ بە(کۆچی شازادە) دەبنەوە. سەرهەڵدانی ئەو ئیحایەش هەر لە کۆچی چاوەڕوان نەکراو و ئەبەدیی ئەوەوە بووە. گیانی خۆی بەدارێکی زڕ ئەزانێت و ئەویش هۆزارێکی شەنگ و خەمناك:

(هۆزارێ بووی شەنگ و خەمناك
لەسەر داری زڕی گیانی سووتاوی ئەنوەر هەڵنیشتی و
هەڵیش فڕیت
تۆ لەلای من منداڵ نەبووی- زۆر گەورە بووی).

لای ئەنوەر سەرکەوتنێك هەیە ئەویش لە بەرانبەر ئەم کەوتن و تەسلیم نەبوونە بەستنەوەی بەهێزی بنچینەی پەیوەندیی ئافرەت و خاکە کە ئەمە خۆی لە ڕاستیدا ئافرەت و مەسەلەیەك ئەگرێتەوە. لای ئەویش لە ڕووە ئەتەوایەتییەکەوە تێکەڵ بەبیرکردنەوە و تایبەتیی شیعرەکانی ئەبێتەوە.

لە سەرەتای نووسینەکەدا بڕیارێکی وەهام دا کە شیعرەکانی ئەنوەر لە زەمینەیەکی ڕۆمانتیکیانەدا هەڵئەچن. خورپەیەکی ناوەخت و هەندێك هەستی تیژڕەون، ئەبنە خەڵفە چنارێکی شەنگ، لق و پۆ دەرئەکەن. بەرەو ڕیالیزم ئەڕۆن و هەندێك جار شیعری وەکو (گوڵسورخی) و (ئیوارەیە و کۆچ ناگرە) پێکدێنن. بەڵام ئەمە هەموو کات لای ئەنوەر

ڕوو نادات بەرانبەر ئەمانەش تێشکان و وێنەی سریالی و بەزین و گەڕانەوە بۆ کەم دەستەلاتی و بێبەرێتی ژیانی منداڵی دێنە پێشەوە، ڕۆمانتیکییەکان بەوە پاساوی هەڵویستی خۆیان ئەکەن کە پەنابردنی ئەمان بۆ گۆشەگیری و سروشت و دوور لە خەڵك و ژیانی شارەکان ئەوەیە کە نایانەوێت بەشداریی لەو تاوان و کردارە ناڕەوایانە بکەن کە لە شارەکاندا ڕوو ئەدەن، دێهاتەکان ئارامن، هەوا و ئاو و خاك، مرۆڤ و خۆشەویستی خاوێن، هەموو خاوێنن، گەلێك جار مرۆڤ کە سنگی قورس ئەبێت وا هەست ئەکات لە ژێر باری خەمێکی قورسدا تێك ئەشکێت، پەنا ئەباتە بەر ئارامی و کێی و سروشتی جوان، لاپاڵی چیای بەرز و پێدەشتی بەرین و ڕەنگین. ئەوە ئەو هەستە ڕۆمانتیکییە نییە کە مرۆڤ ئیتر لاوازە و ناتوانێت بەرەنگاری خەمە قورسەکەی ببێتەوە. ئەمە مەرج نییە. هەندێك کەس هەن لەزێزمەتێکی ڕۆحی لە سروشت و ئارامی وەرئەگرن. کەسێکی ڕووخاو و پاشکەوتووش نین. بەلام ئاوات خواستن لە هەر گەڕانێك بەدوای ماندوویتیدا ئەبنە هەردوو لایەنە سلبی و مایەی ڕەخنە لەسەر شاعیریەتیی ئەو.

خاوێنیی سۆفیەتی و خاوێنیی منداڵی لەملا و لەولاوە دێنە شیعرەکانییەوە چاوەڕێی تۆزێك لە نووری خوا ئەکات، لە هەورێك ڕائەمێنێت ئاخۆ ببارێت یان نەبارێت، مەلێکی نووراني، قومرییەکی سپی سپی ئەبنە هەموو بوون و دۆزینەوە و ونبوونی، ئەبنە خاوەنی پەیامێك لە خواوە بۆ مەبەستی سۆفییانەی ئەم: (ئەو شێوە لە باوەشی سروشدا مۆرکی ڕۆمانتیکییەکانە، بیر و باوەڕیان خەڵوەتگەریی و دوورە پەرێزییە لە خەڵك، چونکە کۆمەڵ نەخۆشە، سەرچاوەی گێروگرفتە، بارێکی قورسە بەسەر شانی کەسە هەست ناسك و دەروون کەیلەکان(٨)).

خۆشەویستی سەرنەکەوتوو، هەندێك بیرکردنەوەی سۆفییانە تێنەگەیشتنێکی قووڵ لە بنەڕەتەکانی تیئۆری پێشکەوتنخوازانە، تێشکانی هەندێك هیوا و ئامانجی لە ناکۆکی و تێشکانی ئاوات و خواستی نەتەوەکەی. لە ماوەیەکی درێژی مێژوویدا ئەمانە کۆ ئەبنەوە و ئەیخەنە زۆر دژواری و ڕوانینی تەنگ و ڕەشبینەوە.

ئافرەت لە ژیانی هەرچی شاعیرێکدا بێت ئەگەر هەموو شتێکی نەبێت ئەوا کەمیشی نییە، زۆر شت هەر بەئاشکراش دیارە ئەنوەر چەندە ئەسیرێکی بێ دەرەتانی ئەو عیشقە بووە، ناوی لێ ناوە شازادە و خۆشی ویستووە، شیعری بۆ وتووە:

«تۆ لەلای من منداڵ نەبووی زۆر گەورەبووی
گەورەییەك نەمئەتوانی بەزار بیلێم»

بەم جۆرە خەیاڵی ڕۆمانتیکی و بێ هیوایی و ماڵئاوایی ئەو ئافرەتە لە بازنەیەکی تەسکدا گیری ئەدەن -دەرفەتی نادەن- بواری لێ ئەتەنن، پەرەکانی لە بەردەمدا، لە بەرپێیدا ئەڕووخێنن، دەریا بەرینەکانی وشك ئەکات، زریان هەموو شت خوول ئەدات و نوغرۆی ئەکات، باڵندە و هێلانە، مرۆڤ و نهاز، چیا بەسەر ئەکاتەوە ڕەشماڵی ماڵێکی کۆچەری هەڵئەگرێت، گەلە گورگێکی برسی ئەباتە سەر ڕانە مەڕێکی ئاوارە، خاك و خۆشەویستی لە بەرامبەریدا واق وڕماو دڵۆپێك فرمێسك لەسەر گۆنای ئامێنێت و ئەبێت بەهەڵم، ئەستێرەکان مەداریان تێك ئەچێت و ڕووی ڕۆژ وەك چاوێکی خوێن تێزاو، سوور سوور دائەگیرسێت. چرای سەر قافڵەی کاروانێك ئەکوژێتەوە، ڕێگایان لێ ئەگۆڕێت و هەر ئەڕۆن، ڕێ دەرناکەن، پەی بەنهێنیی تاریکی شەو نابەن.

کچێك ئەمی بەجێهێشت و شیعرێکی بەئەمانەت لە دڵیدا دانا هەتا بەسەر یەکتردا سۆز بکەن، ئەم بەسەر ئەودا و ئەویش بەسەر ئەمدا هەر بگرین، گریانێکی بێ ئامان بگرین. خۆشەویستییەکەی ئەنوەر هەموو جار خەڵك ناگرێتەوە. بگرە بەکەناری مەرگ و ژانە بەسوێکانیشدا تێ ناپەڕێت. تەنیا خۆی و ئەون، ئەبێت بەوێنەی ڕۆمانتیکی و کلاسی و ئەگەڕێتەوە.

(لە کن من با وجودی ناس و ئەجناس
کەسـ‍ـــی تێدا نییە ئەم شـــارە بــێ تۆ
هـەموو ڕۆژێ لە تاو هیجرانی ئەمساڵ
تەمـــەننای مـردنی پێراره بـــێ تۆ)(٩).

هەر ئەو تاکپەرستی و دڵدارییە ئەبنە هەوێنی عیشقی لایەنە کزە سۆفییانەکەی و زۆرجار هەمووی لە نووری خوا و قومرییە سپییەکاندا ئەتوێنێتەوە. بێ دەسەڵات گۆشەگیر دائەنیشێت وەك بڵێت خوایە بەزەییەك، تیشکە ئایدیالییەکانی بەسەردا پەخش ئەبن و تەواو خۆی ئەدات بەدەستەوە، ئەبێتە مرۆڤێکی ئایدیالیستی لەوێدا ئەوەستێت و بەو تیشکە ئایدیالییە ئەیەوێت ڕووناکییەك بخاتە ناو:

(بەدەرە دەس سەرما و سۆڵە
گشت پەنجەرە و دەرگاکانم لەسەر داخە
لێت دڵگیر نیم
تەنها جارێك وەکوو جاران

وەرە وەرە بەپیرمەوە»
«تۆش بۆزراوی
دەمها چاوم دەمها دڵی بیابانم
دەمها وڵاتی بەرین و بێ هەتاوی
شیعری بێ بارانم.)
(پل و پووشی هێلانەکەت لەسەر داری ڕووت و قووتی وەرزی من
لەسەر داری ڕووت و قووتی وەرزی من
بەجێ هێشت و بۆ خۆشت دات لە شەقەی باڵ»

مرۆڤی شاعیر هەندێك جار ئەکەوێتە حاڵەتی سەیرەوە، ئەیەوێت هەر بۆ خۆی بژیت، خۆی و ئەو، ئیتر ئەوانی تر، خەڵك ئەبنە گۆمێکی وەستاو و هەر زوو بەتیشکێکی کوتوپڕ بەشێوەی هەڵم بەرز ئەبنەوە. ئەگەر شاعیر لەم ڕۆژگارەدا بەرپرسیار نەبووایە ڕەنگە وەك خەڵکە سادەکەی گەلێك ڕواڵەت و حاڵەتی لاوەکی لێ وەرگیرایە و ئاسایی تێ بپەڕیایە.

بەڵام ئەم لە پێش ئەوانەوەیە، کەم و زۆر هۆشیارانە و زووتر لە کارەساتە جیاوازە چینایەتی و کێشە نەتەوەییەکە ئەگات و شیکردنەوەی خۆی هەیە.

مەبەستیشم لەو جۆرە بیرکردنەوەیە نییە خەڵك هەمووی ببنە خاوەنی مەبەستی خۆیان و بگەنە جێ، بەڵام شاعیرەکە کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە لەو سامانی دەستکەوت و تێکۆشانە هیچی بێ نابڕێت.

بەڵکو ئەم حیسابە وشکە لە هەندێك تیئوری خۆکرد و قسەی زلدا دێتە پێش کە فرێ بەسەر فەلسەفەی شیعر و ساتە ناسکەکانی شیعر و مەدای مێژوویی و بڕکردنی دەنگی شیعرەوە نییە. ڕوانینێك بۆ ئەم کێشەیە کە پێچەوانەی ئەوەی تر بێت خۆشەویستییە بەمانا فراوانەکەی خۆشەویستییەك لە ئەنانییەت و زاتییەت و خۆ تەرخانکردن بۆ تاکە کەسێك، دوور بێت، لەو عەشقەی تاك و کۆ پێکەوە گرێ بدات. جوانی لە چۆنیەتی و (چەند)یدا، بەدی بکات. (هەمەکی)ش هەرگیز قەناعەتی بەوە نییە بەشێکی لێ داببڕێت نیگاری تەواوی خۆی کەموکورت دەرکەوێت. لەبەرئەوەی پارچە بەشێکە لە هەموو، ئێمە کە خاوەنی ڕاستی کێشەکەین هەموومان دەدۆزییەوە، زۆر ناڕەوایە پارچە جوێ بکەینەوە و بەدیوێکی مەوزووعەکەدا هێمای بۆ بکەین.

(لە جیهانێکدا کە ڕووی جوانت نەخشینترە لە وێنەی گوڵ لە ئاوێنەدا، لێرەدا، لەو

جێگایەدا نوقمبوونی تەواوە هەموو بوونم نەبێت بەسۆزێکی بەلێشاو ئەوەش خۆشەویستییە. ئەو خۆشەویستییەی هەموو کەس ئەگرێتەوە[10]). لای من تایبەتیی دژواری و هەندێك تێشکانەی ئەنوەر ئەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی فەلسەفەیەکی ئەگۆڕاوی بنج بەستی شیعری، ڕەنگە (گوڵسورخی) و (تاتیانای شەنگ) و (پۆل ڕۆبسن) تەواو دژوار بووەستنەوە لەگەڵ گەلێك شیعری دیوانەکەدا، بەتایبەتی لە ڕووی ڕێبازی فیکری و هەڵسەنگاندنی چەند کێشەیەك. شیعرەکان یەك ڕێچکەیان نەگرتووە، ڕێگاکەیان پڕە لە بەرزی و نزمی، کۆسپ و قۆرتی گەورە، هەندێك جار هەموو شت لای شاعیر لە تۆزە نوورێکی سەوزی خواییدا کۆ ئەبێتەوە، کە شاعیر تەواو تەسلیمی ئەو بیرە ئایدیالییە ئەبێت و هەتا دێت دیوارەکانی ژوورەکەی دێنە پێشەوە و ماوە و دەرفەتی تەنگ و تەسك ئەبێتەوە، ناچار ئەخنکێت و خۆی بەمردن ئەسپێرێت. ئەیەوێت جارێکی تر نەیەتەوە ژیان، دوور دوور بڕوات و خەونەکان فەرامۆش بکات. ئەمە حسابی گشتیی دیوانەکە نییە بەڵکو تەنیا وەستانە لەسەر ئەو لایەنە زەقانەی کە زیاتر دژوارییەکان لە نێوان ڕەوتی فیکری شیعرەکاندا پەرە پێ ئەدەن، زیاتر لە پێویست سەریان پێ هەڵ ئەدات، مۆرکی ڕۆمانتیکی و هەندێك تیشکی ڕۆمانتیکی و میتافیزیکی شیعری فارسی دێتە شیعرەکانەوە ئەکەوێتە ژێر تەئسیریانەوە بەدەگمەن وەك یەك نموونەی شیعریی گوڵسورخی و دەنگی مرابیوس دێتە گوێ. لە چاوی ئەو دیاردانەوە تەماشای ژیان و خۆشەویستی ئەکات لە هەمان کاتیشدا ئەو دیاردەیە بەلایەنە ئایدیالییەکەیدا کەرتبوون و پەرشی فیکری شاعیر کۆ ئەکەنەوە و ئامادەی ئەکەن بۆ گرتنەبەری ڕێگایەکی نزیکتر لە خواو چۆنیەتی گۆڕانکارییە بەردەوامەکانی سروشت. سەردەمی منالی و گەشەکردنی هەستی منداڵیی ئەو لە خێزانێکی ئاینییەوە هاتووەتە دی و هەڵچووە.

بەشیعری مەولەوی گوێی زرنگاوەتەوە و ئەشێت هەر لەو دەنگەوە عەشقی بیر لێکردنەوە و حاڵەتی سۆفیەتی بوویێت، بەلام ئایا ئەنوەر چۆن مامەڵەی لەگەڵ کێشەی سۆفیەتی کردووە؟ ئایا ئەو تیشکانە لە سەراپای شاعیرییەتی ئەنوەردا چۆن دەرئەکەون؟ پێشەکی ئەڵێم ئەو تیشکانە تەنیا وەك شتێکی لاوەکی و لا تەریك، کەم نەفەس و تێژڕەو بەشیعری ئەنوەردا تێئەپەڕن:

(تیشکی وێنەی ڕوخساری خوا لە ئاسمانی
پاکی دڵیا لە پڕ دەرکەوت و ونیش بوو)
(گەر نیهالی هەڵچوونی ئازار

بەتەوری وەردی ببڕم
گزەمیەکی وای تیا ئەبێ، گەر داگیرسێ
تین و هانای مەشقەڵانی بەرزی ئاگر
بەڕووی دووری پڕ لە نووری خوادا ئەچێ).

مەولەوی کاریگەری تەواوی خۆی لە شیعری ئەنوەردا نواندووە. بەڵام زیاتر لە ڕووی وێنەی شیعری و ئەو ئەغمە فۆلکلۆرییەی هەیەتی ئەمنا وەك بیر و هەستی سۆفییانە بەئەگمەن بەلایدا ئەچێت.

زۆرجاریش دوورە پەرێز لێی ئەوەستێت، ئەمەش بەهێی لێکدانەوە زانستییەکە و مەفهوومی سۆفیەتی ئەتوانین دیار و ئاشکرا بەڕواڵەت و ناوەڕۆك دەستنیشانی بکەین.

لەم شیعرانەدا تارمایی (مەولەوی) ئەبینرێت لە ڕووی ناوهێنانی مەولەوی ئەوا نموونەی پەیوەندیداری نزیکبوون بەمەولەوییەوە شیعرەکانی وەك (زیندە خەو و تارماییەکان، ئێوە ئەو بایەن کێو لە بن دێنن، زریان، وەرە خوارێ ئەی خواکەی غەریبان، سۆناتەی تینوویەتی، ساماڵ، خاك و زریان و خۆشەویستی، بەدەرە ئەس سەرما و سۆڵە) لەو شیعرانەدا تەئسیرەکان ڕووکەشن، ناوهێنان و وێنەی شیعری و کێشە شیعرییە دە برگەییەکەیە. هەروەها سۆفیەتی فەلسەفە نییە، بەڵکو ڕێبازە، تاقیکردنەوەیەکی گیانییە، گەڕان و ماندووبوونە بەشوێن حەقیقەت و شتە هەرە خاوێن و بێ گەرد و بەرزەکاندا.

لە حاڵەتی سۆفیەتیدا ئەوەی پیرۆز و شایەنی ڕێز و کڕنووش بۆ بردن و بەرزێتییە تەنیا خوایە و بەس. (خوا و هەموو شتەکانی ئەڵێم هەموو شت لە خوادا زیندووە و ئەبزوێ، پەنهان و نهێنییە[11]). (ئیرادەی خوا و یاساکانی سروشت دوو ناون بۆ یەك ڕاستی بەکاردێن[12]).

کەواتە هەموو شتەکان لە خوادا کۆ ئەبنەوە، لە هێزێکدا کە تواناو تینی هێزەکانی کەیە. سۆفی ئەم بۆچوون و بیرکردنەوەیەی هەیە. سروشت، یاساکانی گۆڕانی، بەهێی نیاز و ئارەزووی خوا ئەجووڵێت، هەوڵی هەمیشەیی ئەو بۆ نزیکبوونەوەیە لە خوا، لە ساتە هەرە سەخت و ناهەموارەکانیدا، ناوی خوا دووبارە ئەکاتەوە و داوای بەخشینی لێ ئەکات، ساتێك ئەگەر لەو زیکرە غافڵ بێت بەناتەواوی و بێ ئاگایی ئەزانێت دەرهەق بەخۆی. ئەنوەر شاعیرێکی سۆفی نییە، هیچ شیعرێکیشی نییە حاڵەتی سۆفیەتی و

باوەڕی سۆفیانەی تیادا بێت. بەڵکو هەندێك ڕەلالەتی هەیە وەك تیشکێك گوزەر ئەکات زۆرجار کە حاڵەتی تەسلیمبوون وەرئەگرێت نەبوونی بەدیلێکی فیکریی مادییە، هەر بۆیە شتە ڕووحییەکان لای ئەو جێگای خۆیان ئەگرن.

دووەم هۆی بۆ ئەو دیاردەیە گەڕانی شاعیرە بەدوای ئەوپەڕی خاوێنی و بێ گەردیی شتێکدا کە دەستی مرۆڤ پێی نەگەیشتبێ، ئەم خاوێنی و خاسیەت و جەوهەری عیشقی خۆی لەودا بەدی ئەکا ئەمەش مەزاجێکی ئەفلاتوونی دروست ئەکات، کە مەزاجی فەلسەفەی شیعرە، بەتێکەڵبوون بەڕێبازێکی ئاینی، ئەم ڕێبازە لای (ئەفلۆتین) هەبووە و لە ئەوەی تازەش وەك (سپینۆزا) ئەم ڕێگەیەیان گرتووە (جەوهەری سۆفیەتی حاڵەتێکی یاخود تاقیکردنەوەیەکی گیانییە، کە سۆفی تووشی دێت. فەلسەفەش نییە بەو مەبەستەی فەلسەفە هەیەتی کە بریتییە لە وردبوونەوەیەکی عەقڵی و تیئۆری لە سروشتی بوون سۆفی فەلسەفەی ئەوە لێ نادات کە تاقیکردنەوە ڕووحییەکەی بکات بەبناغەی تیئۆرێکی میتافیزیکی لە سروشتی بوون دا[١٣])

لە ئاستی شیعرەکانی ئەنوەر گەلێك شت خۆ ئادەن بەدەستەوە، نهێنیی شیعری باش لەوەدایە، لە خوێندنەوەدا هەست ئەکەی بەشەقامێکدا ئەڕۆیت یەك ڕەنگ گۆڕانییەکی مەنگ و لەسەرخۆت بۆ ئەڵێت، ئەو کەرەسانەی لای ئەم دەست ئەکەون لای کەسانی تر دەگمەنن یاخود هەر نین. ئەگەرچی هەندێك جار کەرتبوون و (ضیاع)ێکی تایبەتی لە شیعرەکانیدا هەست پێ ئەکرێت بەلام ئەو ڕاستەقینەی ناخی خۆی ئەنووسێتەوە، واتە ونبوون و دۆزینەوەکە هاوشانی یەك ئەبنەوە، ئەگەر شیعری سەرکەوتوو هەموو گەردوونیش لە دڵی خۆیدا کۆنەکاتەوە ئەتوانێت شاهیدی دروستبوون و حەقیقەتی ڕووداوە سامناك و خۆش و ناخۆشەکانی تەنها ئەستێرەیەك بێت لە گەردووندا. لە (زریان)دا چەند شارێك وێران ئەبن ئەکەونە بەرەی ونبوون و ئەم بەمێژوویان ئەسپێرێت، چەند شارێکی تریش، لە تەنیشت یەکدا پڕ لە تیشکی خۆرن، لە سۆناتەی تەنوویەتی ئەمدا، تیشکی هەتاو مەقەستێکە هەموو داوێك ئەقرتێنێت، فەروخی فەروخزاد ئەڵێت: «هەندێك شیعر هەیە نە دەرگایان کراوەتەوە نەداخراون، چوارچێوەیان هەر نییە، شەقامێکن کورت یا درێژ، /ئینسان هەیە ئەڕوا و ناگەڕێتەوە هەیە ئەڕوا و ئەگەڕێتەوە[١٤]». شیعری ئەنوەر لە ئەنجامدا کۆمەڵێك نهێنی ئەهێڵنەوە، خورپەیەکی کاتی و ساتێکی شیعریی لای خوێنەر نابێت بەتەنیا لە بیربوونی کاتی خوێندنەوەکە لە پاشدا ونبوونی لە شیعرەکانیدا زۆر نیاز و هەقیقەتی بیری پێشکەوتنخوازانە ون ئەبن،

جۆرە بیرێکی ئایدیالی و تیشکی سۆفیەتی نەرنەکەون، ئەم بەهەنگاوێك لە بۆچوونیدا لە هەستی نەتەوایەتی خۆیدا ئەیان دۆزێتەوە. ئەگەریش زیاتر بەناخی (گوڵسورخی) و (نان و گوڵەکەی)دا ڕۆیچیت، هەڵبەت هەنگاوێك ئەبێت ئەو بەهرە و شاعیریەتەش وەك چراخانێك دێتە بوون ئیتر ئەمیش هەمیشە شیعرێکی تێدا ئەنووسێتەوە، هەر وشەیەکی ئەوەندەی فرمێسکێك لە چاویدا مات بوویێت، ئەوەندەی خەندەکیش تەمەنی ئازادی هەموو سەر زەوی لە تەمەنی ئەمدا بتوێنێتەوە!

## سەرچاوەکان

تێبینی:

ئەو شیعرانەی بەشێك یاخود واتایەکم لە لێکۆڵینەوەدا بەنموونە هێناوە هەموو لە (زریان)دا هەیە. بەپێویستم نەزانی ناونیشان و ژمارەی لاپەڕەکانیان بنووسمەوە.


(١) چاو پێکەوتنێك لەگەڵ ئەنوەر قادر محەمەد ڕۆژنامەی (العراق) ١٢-٩-١٩٧٦.

(٢) دیوانی مەولەوی -ل ٥١٥- کۆکردنەوە و لێکدانەوەی- مەلا عەبدولکەریمی مدرس.

(٣) دیوانی حەمەدی-ل١٣٤

(٤) سروشت و دەروون -گۆران- شیعری (هەوری پایز).

(٥) پێشەکی شانۆگەری -شیرین و فەرهاد-ی نازم حیکمەت. گۆڕینی -أکمل الدین أحسان.

(٦) زریان -ل١٤

(٧) شیرین و فەرهاد - نووسینی نازم حیکمەت.

(٨) الرومانتيكية -محمد غنيمي هلال- ل١٦٩

(٩) دیوانی نالی-د. مارف خەزنەدار- ل٩١

(١٠) الازهار تورق داخل الصاعقة-حسين مردان-ل١٩٨

(١١) قصة الفلسفة-اول ديوارنت-ل١٥

(١٢) هەمان سەرچاوە.

(١٣) التصوف- الثورة الروحية في الاسلام-د. ابو العلاء عفيفي.

(١٤) فەروخی فەروغزاد- شیعر و ژیانی- گۆڕینی -ئەنوەر قادر محەمەد- ڕۆژی کوردستان ژمارە (٤) ساڵی ١٩٧٦.

# شیعرەکانی کامەران و ئیستاتیکا

لە پێش ئەوەدا باس و پێناسەی وشە یاخود واتای ئیستاتیکا بکەین و پەیوەندی ئەم زانستە بە شیعرەکانی کامەرانەوە ڕوون بکەینەوە، دەڵێین -ئیستاتیکا زانستێکی نوێی هەڵقوڵاوی کێشەکانی ئەم چەرخە نییە، بەڵکو هەر لە کۆنەوە هەر لە جیهانە گەورەکەی فەلسەفەی یۆنانییەوەدا هاتووە و دیالۆگی -هیگلس-ی ئەفلاتوون بەکۆنترین سەرچاوە و لێکۆڵینەوەی جوانناسی دادەنرێت. بەڵام وەك چەسپبوونی ناوێکی زانستی و قووڵبوونەوەی چەمك -مفهوم-ی ئەم زانستە لە ساڵی (١٧٣٥)ی زاینیدا لە لایەن زانای ئەڵمان -جومگارتن-ەوە دامەرزا[1]، ئیتر لەو کاتەوە و لە پەرەسەندنی کێشەی نێوان بیروبۆچوونی ئایدیالیستی و ماتریالیستییەوە، لێکۆڵینەوە و بیروڕا و تاقیکردنەوە و دۆزینەوەی نوێی لە بارەوە ئەنجام دراوە.

ئەم زانستەش لەبەرئەوەی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەجیهانی مرۆڤەوە هەیە ئەوا دیارە مرۆڤ نەك هەر لێی بێ ئاگا نییە، بەڵکو بەهۆی نزیکی و ئاگاداری تەواویەوە لە کارتێکردنی ئەم فەلسەفەیە لە ژیانی هەمیشە دەیهێنێتە ناو کۆڕی باس و لێ وردبوونەوە و تاقیکردنەوەی نوێوە.

## ئیستاتیکا چییە؟!

ئیستاتسکا زانستێکی فەلسەفییە لە سەرەتا گشتییەکانی هەڵوێستی ئێستاتیکی ئادەمیزاد بەرامبەر واقیع دەکۆڵێتەوە و هەروەکو فەلسەفە زانستێکی ئایدۆلۆژییە هەوڵ دەدات کە چارەسەری گیروگرفتی پەیوەندی هۆشمەندی ئیستاتیکی و هونەرەکان بەبوونی کۆمەڵایەتی واتە ژیانی ئینسانییەوە بکات[2].

ئیستاتیك- بریتییە لە مێژووی فەلسەفەی هونەری و دانانی پێودانێك بۆ جیاکردنەوەی جوانی لە ناشیرنی و بایەخ پێدانی و هەڵسەنگاندنی بابەتەکانی هونەر، پەیکەر، نیگار، وێنە، شیعر، مۆسیقا[3].

وەك وتمان کۆنترین سەرچاوە کە باسی جوانناسی، واتا ئیستاتیکا-ی کردبێ دیالۆگی -هیباس-ی ئەفلاتوونە، ئەفلاتوون هونەر و جوانییەکانی هونەر بەڕەوشتەوە دەبەستێتەوە وە پەیوەندی هەردووکیان بەخوڵقێنەری جیهانەوە باس دەکات. هەروەها

-بومگارتن-ی ئەڵمانی لە (١٧٣٥)دا باسی چێژی هونەری و ئەو کەرەستانە دەکات کە چێژی هونەری لە شیعر و مۆسیقا و وێنە و پەیکەر و شانۆ و گەلێ بابەتی هونەریدا دروست دەکات.

لێرەدا دەپرسین، ئایا جوانی و فەلسەفەی جوانی چییە؟ بۆ ئەم مەبەستە چەند بیروڕایەك هەیە کە پێویستە ئەگەر زۆر بەکورتیش بێت ڕوونی بکەینەوە.

١- جوانی دیاردەیەك نییە کە لە ناو شت خۆیدا هەبێت، واتە سیفەتێکی موتڵەقی ئەو شتانە نییە کە پێیان دەڵێن جوان، بەڵکو بریتییە لە کارکردنی ئەو شتانە لە مێشکی ئێمە، لەو سۆز و هەڵچوونە دەروونییەی ئێمە بەرامبەریان دەری دەبڕین[٤].

٢- هیگل دەڵێت: «ئێمە بمانەوێ و نەمانەوێ هەندێ شت جوانە بەڵام ئەم جوانییە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت واتە دیاردەیەکی نیسبییە»[٥]

ئینجا بەرامبەر ئەم بیروڕایانە و لە ڕۆشنایی فەلسەفەکە خۆیدا ئەگەر تەماشای یەکێك لە بابەتەکانی جوانی بکەین کە ئیستاتیکا بە بەشێك لە خۆی دەزانێت کە شیعرە دەڵێین، جوانی لە هێزەکانی خۆشەویستی و چاکە و خێر و برایەتی و مرۆڤایەتی دروست دەبێت، ئەمانەش هەموویان لای شاعیر کۆدەبنەوە و دەبن بەڕاستی واتا هەقیقەت، شاعیر هەمیشە هەوڵ دەدات کە لە ڕێگەی جوانییەوە بەدوای هەقیقەتی شتەکاندا بگەڕێ بیاندۆزێتەوە لە ڕۆشنایی ئەم ڕستەیەدا دوو خاڵی سەرەکی هەیە دەبێت بیخەینە پێش چاو ئەوانیش چێژ لێ وەرگرتن و سوود پێ بەخشینە.

ئێمە لە یەکێ لە پەنجەرەکانی ئەم زانستەوە کە شیعرە تەماشای شیعرەکانی کامەران دەکەین.

کامەرانی شاعیر هەردوو دیاردەی جوانی و سروشت پێکەوە ناوێتەی تابلۆیەکی مرۆڤانە دەکات. جوانی مرۆڤ، جوانی سروشت لە کارەساتێکدا دەڕژێنێت، هەستی ئیستاتیکی دەهەژێنێت و نیشان دانی وێنەی جوانییە ڕاستەقینەکەمان بۆ بدۆزێتەوە.

ئێـــــــوارە بـــــوو، پرشنگی خــــــۆر
دوور کـــــــەوتەوە لە شــــــار بــــەزۆر
هــــەوری پـــــــایــــزی ڕەش و زەرد
چین چین ئەنیشتە سەر ڕووی هەرد
گۆیــــــژە گریـــــــا بـــــەخــــــوڕ

لافـــاو هەستا بە تین و گوڕ
ئاسمان بەرگێکی پۆشی ڕەش
مەرگ ناو شاری گرتە باوەش
خـوێناوی شاخی مات، تەزیو
خانووی ڕانەدا بۆ نـــاو شیو(٩)

کامەران تەنها ئەوە دەرنابڕێت کە سروشت بەو جۆرە لە حاڵەتی ئاسایی خۆی دەرچووە و جوانییەکان گۆڕاون بەڵکو ئەمە بەحاڵەتی ئینسانییەوە دەبەستێتەوە ئەوەی شاعیر لە ڕوانـینـیدا بـۆ جـوانـیـیـە ژاکـاوەکـانی سروشت نرخ و بـەهـای ئـەو سروشتـە بـۆ مرۆڤ دەستنیشان دەکات، ئەو سروشتە کە نیشتمانی ئەوە، کە خاکێکە لە چاوکردنەوەدا هـاوڕاز و هـاوناڵەی یەکترین بەم جۆرە کە دەڵێت:

«من دایکی تۆم، بەڵام گیانە
ئەم وڵاتی کوردستانە
تۆی پەروەردە کرد بە جوانی
تۆش سا ببە بە قوربـانی»(٦)

شاعیر لـەو پـارچـە شیعرە بچووکـەدا حـاڵـەتـێکـی مرۆڤـانـە پێکدەهێنێت وەك وتـمـان دیاردەی جوانی بەهـەموو شێوەکانییەوە چێژ لێوەرگرتن و سوود بەخشینە، واتا لایەنی یەکەمی ئەوەیە کە ئەو سروشتە ئەو وڵاتە ئەمی پەروەردە کردووە فێری خۆشەویستی کردووە زەوق و چێژی پێ بەخشیوە، ئەمیش بەهـەموو هەست و هۆشی ئیستاتیکی خۆیەوە دەبێت شتێك هەر شتێك بێت خێر و چاکە و خۆشەویستی پێشکەشی ئەوی بکاتەوە کامەرانی شاعیر تەنها قوربانیدان و خۆ بەخت کردن بدۆزێتەوە.

وتمان لە کارەساتی یەکەم و ژاکانی سروشتدا قوربـانی دانی دۆزییەوە لێرەشدا لە پـارچـە شیـعری کـەمـانـچەدا هـەستـانـەوە، دروست کردنـەوە ژیـانـەوە، دەدۆزێتـەوە، ئـەم سیفـەتـانـە لای ئـەو دەبنـە مـامـەڵـە کردنی لـەگـەڵ جوانیدا، چونکە ژیانـەوە حـاڵـەتێکی مرۆڤانەیە و لەهێناوی چاکە و خۆشەویستیدایە لە شیعری کەمانچەدا دەنووسێت.

شکـــانیان کەمانچەی دەستم
بەڵام زوو فریا کەوت هەستم
دروســتی کـرد لە پەڕەی دڵ

تەلەکـــانی لە تــاڵی گـــوڵ
دەنگــی بڵنـدە وەك ژیـــــان
بەسۆزە وەك قاسـپەی بــەیان

لای کامەران کەرەستەکانی شیعری جوان هەمووی ئامادە دەبن هەتا شیعرێکی جوان دروست بکەن، نەك تەنها جوانی لەپێناوی جوانیدا، بەڵکو شیعری جوان لە پێناوی ژیاندا. لە پێناوی شیعری گەشدا وەك پشکۆ، کامەران لەو شیعرەدا جۆرە هێمایەك دەکات کە شیعری پشکۆیە ئەمە دەبێتە ڕەمزێك لەپێناوی دەرخستنی مەفهومێکی جوانیدا، کە جوانی خۆشەویستەکەیەتی. جوانی مرۆڤێکە:

چیم زانی لە وردەکاری
لە وەسفی جوانی دڵداری
هەمووم کرد بە شیعر بۆ تۆ
بە هۆنراوەی گەش وەك پشکۆ[٩]

کامەران وەك شاعیرە ڕۆمانتیکییەکان باسی سروشت ناکات، جوانییەکانی سروشت بۆ داڵدەدان و پەنا بردنە بەر چێژ و زەوقێکی ڕۆمانتیکی و دوورکەوتنەوە لە خەڵکی نییە بەڵکە دروستکردنەوەیە واتا –حالة البناء والارتقاء–ة کە تەنها دروستکردنەوە نییە بەڵکە گۆڕینی ژیانە لە کاتی دروستکردنەوەدا. لەو بەڵێنەدا کە ئەو سوێندی خۆشەویستی خۆی ئەخوات دێتە دی لە دیمەنی ئافرەتێکی چەوساوەدا. کە زیرەکی شاعیر نیشان دەدات لە وێنەگرتنی ئەو دیمەنەدا:

مەمکی ژێر کراسی دڕاو
لە شەرما ئەلەرزێ بەتاو
شتباڵی وەك هەوری زل
تیا دەرئەکەوێت لاڕانی شل[١٠]

یاخود ئەم پارچەیە کە دەڵێت:

لەم دیارییانە لای من کە ڕەنگینتر بێ
یا لەمانە جوانتر، نازەنین تربێ
بەڵێنێکە کە شیرازەی ژیانی
من و تۆیە، هۆنیمەوە بە جوانی[١١]

وەك لە یەكێ لە پێناسەكانی ئیستاتیكدا نووسیمان، زانستی ئیستاتیك دیاریكردنی هەڵوێستی مرۆڤە، هەڵوێستی جوانناسی و مرۆڤایەتی و مرۆڤ بەژیانەوە واتا بەواقیعەوە. ئەو واقیعەی یەكەم مامۆستا و ڕابەری شاعیرە، لێوەی فێر دەبێت و بەهەمان شێوە ئەویش دەیەوێت ڕووناكییەك چەندە كەمیش بێت بكاتە دیاری و نیشانەی هەستی مرۆڤانەی خۆی بۆ سروشت بۆ واقیع. بەڵام لەپڕ وەك برووسكە بەچەند دێڕێكی كەم دەچێتە ناو دڵی واقیعەوە، واتاكانی، جوانی سروشت جوانی ئافرەت، دەژاكێن و، حاڵەتیان دەگۆڕێت.

جوانی سروشت و هی ئافرەت

لە عەزرەت ئازاری میللەت

ژاكابوو وەك گوڵی پایز[١٢]

بەم چەند نموونە كەم و خێرایە ناتوانیت هەموو سووچەكانی بابەتی كامەران و ئیستاتیكیا پشكنین، بەڵام وەك چەند هێمایەكی خێرا بەلایدا گوزەرمان كرد ئەم باسەمان هەتا ئێرە بەبابەتی دروستبوونەوە و گەشەسەندن لە هەستی ئیستاتیكی كامەراندا. بەڵام نابێت لایەنێكی گرنگ كە حەقیقەتێكی نكوڵی لێ نەكراوە لە هەستی ئیستاتیكی كامەراندا فەرامۆش بكەین ئەویش زەرد بوونی ڕەنگە ئاڵەكان و تەماوی بوونی دیمەنە ساف و گەشەكانە. ئەمە نابێتە بەڵگەی ورەبەردان وەستاندنی هەستی ئیستاتیكی كامەران چونكە ئێمە وتمان ئیستاتیكی هەر فەلسەفە و زانستێك جوێ كردنەوەی لە ڕواڵەت و شتە ناشیرینەكان واتا هەستی ئیستاتیكی و فەلسەفەی جوانناسی و هونەر و هەستی خۆشەویستی باوەش كردنە بەهەموو ژیاندا. بەخۆشی و ناخۆشییەوە بەهاودەمی و بەتەنیاییەوە. واتا مامەڵەكردنێكی ڕاستە لەگەڵ واقیعدا، وە ڕاستگۆیی و دیاریكردنی هەڵوێستیش یەكێكە لەو سیفەتە مرۆڤانەیەی كە بەدەستخستن و بوونە خاوەنی هەروا ئاسان نییە. جیهانی هەر شیعرێكیش ئەگەرچی جیهانێكی تایبەتییە بەڵام دیسان بەشێكە لە ژیانە گشتییەكەی ئەو كۆمەڵەی كە تیایدایە بەدرێژایی مێژووی فەلسەفی بەپێی گۆڕانی هەر سیستەم و كۆمەڵ و ڕاونینی جیاواز و پێناسە و تێگەیشتنی جیاواز و پێویستتر بۆ فەلسەفەی ئیستاتیكیا كراوە. تێگەیشتنی ئیفلاتون لە ئیستاتیكیا و پێناسەكردنی جیاوازە لە بۆچوونەكانی هیگل یاخود دیكارت و شارل لالو، كروتشیە هەتا دەگاتە لێكدانەوەكانی بلێنسكی و چرنشیفسكی، لە هەر قۆناغێكدا بەچەند جۆر پێناسە و تەفسیری ئیستاتیكا كراوە. لە زۆربەی ئەو ڕوانینانەدا هەموو حاڵەتە

ئـاسایـی و نـائـاسایـیـیەکانی مرۆڤ دەستنیشان کراوە هـەروەك چۆن و لـە سروشتدا درەختێك لە بەهاردا سەوز دەبێت و گەڵا دەکات و بەرهەمی دەبێت هەر هەمان درەخت لە پایزدا دەگۆڕێت و گەڵای دەوەرێت بەڵام ئەوەیە درەختە و ژیانی تێدایە و بنج بەستی زەوی خۆیەتی. بەهار دێتەوە دەژێتەوە ئینجا ئەو بەشە لە شیعرەکانی کامەران کە هەستی ئیستاتیکی بەبارێکی جیاوازدا شکاوەتەوە هەر ڕەنگدانەوەی دڵسۆزی حاڵەتی مرۆڤانەی ئەوە لە هەڵسەنگاندنێکی جوانییەکاندا، ڕوانینی کامەران بۆ سروشت و بۆ کۆمەڵی دەوروپشتی لەو ڕوانگەیەوە سەر هەڵدەدات کە سروشت و کۆمەڵ جوانەوە هەقیقەتە و واقیعە، بەڵام وەك مەنتیقی فەلسەفەی ئیستاتیك ڕوانینەکان نیسبییە نەك لە کەسێکەوە بۆ کامەران. بەڵکو لە سەردەمێکی ژیانی ئەوەوە بۆ سەردەمێکی ژیان خۆی دەهارێزێت و نامرێت بەڵام ڕوانینەکان دەگۆڕێن. واتاکانی -ئەوسا- و -ئێستا- سەرهەڵئەدەن و جیاوازی لە ڕوانینی ئیستاتیکی ئەودا دروست دەکەن لە تەماشاکردنی تەنیا شیعرێکدا ئەم حاڵەتە دیار دەدات، کە دەڵێت:

ئەوســـا دنیا لەلای دڵــم خــۆش و بــــەرین بوو
باخــی هەستم گوڵزارێکی گـــەش و ڕەنــگین بوو
بەهــــاری گیان هەمیشە تەڕ، جــوان و پــاراو بوو
لە دەروونا خورەی تاڤــگە و قەڵبەزەی ئاو بـــوو (۱۳)

شاعیر لێرەدا ئەم وێنانە دەنێتە لاوە و واتا ئەوسا دەکات بەئێستا و سەردەم و ڕۆژگارەکە، واقیعەکەی خۆی، هەستە ئیستاتیکییەکانی خۆی بۆ ئێستا دەگوێزێتەوە و دەڵێت:

ئێستە هەرچـــی ئەندێشەیەك پـــاراوی خــــەمە
لەنـــاو دڵ و لــــە دەروونی تاریکـــا هــەمە
هــەرچی خونچەی ئاوات هەیە هەموو هەڵوەرین
هەرچـــی چاوی یادم هەیە هەموویان ئەگرین
چـــاو لێڵاویی و دڵ ناســـۆزی تاریکی داهات
خەفەت لەگەڵ جـــەهەننەمی دەروونـــــم ڕاهات(۱٤)

بەم شێوەیە جیـاوازی ئیستـاتیکی دروست دەبێت لەگەڵ گۆڕانی واقیعی دیارەکان ئاڵوگۆڕی زیاتری مەسەلەکاندا کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەواقیعی ئیستاتیکی و ڕوانینی شاعیرەوە هـەیە بۆ کۆمەڵ بۆ سروشت بەتایبەتی لە دوا دیوانیدا -دیوانی زەبری

هۆنراوە-دا زیاتر ڕەنگ ئەداتەوە، بەلای منەوە لەو جۆرە گۆڕانەشدا کامەران هەر ڕاستگۆ و شاعیر بوو، ئینجا بڕوانە وشەکانی، ڕاستگۆ، شاعیر. کە هەرچۆن بێت ئەو ژاکانی جوانییەکان و بەساختەکردنی هەقیقەتەکانی بەڕەوا و بەهەق نەمزانی، دەبوا هەڵوێستی هەبێ واتا شیعری هەبێ. کامەران تەنها بەیەك بەیت شیعر کێشەکە دەکاتەوە و دەڵێت:

لەلای ئێوە، گڵ مەیل بڕ شەهید ناو ون بوو

کێ نەسووتێ، با بسووتێ، ببێ بەسووتوو(١٥)

بەڵام کامەران هەر لەو دیوانە شیعرەدا و لە شیعرەکانی ئەم دواییەدا ئەگەر بەوردی سەرنج بدەین دەبینین کە تێگەیشتن و هەستە ئیستاتیکییەکەی ئەو زیاتر بەلای هەستی جوانی نزیکبوونەوە لە ژیان و کارەساتەکانی ژیاندا ڕۆچووە و تیایدا قووڵ بۆتەوە.

ڕاستییەکان گەشتر خۆیان دەنوێنن و وەك لە پێناسەی فەلسەفەی ئیستاتیکدا وتمان ئیستاتیکا فەلسەفەیەکە باوەش دەکات بەژیاندا، ئەوا لەو شیعرانەدا هەست دەکەین کە باوەشی کامەران چەندە باوەشێکی گەرم و پڕ ناسووبە بوو ئەو ژیانە تاڵ و پڕ لە چەرمەسەری و دڵشکانەی، بۆیە لایەنی دووەمی کێشەکە ساغ دەکاتەوە و بەرەنگاری ڕەشەبا دەبێتەوە لە جاران جوانتر دەڵێت:

«ئەو دڵەی وەك دڵان نییە

ترسنۆك و نیان نییە

دڵە گەشەکەی جارانە

دڵی پاکی تێکۆشانە»

## سەرچاوەکان:


١- فلسفة الجمال و نشأة الفنون الجميلة. محمد علي ابو ريان-ل٣٢.

٢- مبادىء علم الجمال -شارل لال. ترجمة- مصطفي ماهر.

٣- الموسوعة الفلسفية المختصرة -ل٢٠-.

٤- سەرەتاکانی ڕەخنەی ئەدەبی- ئای. ئەی. ڕیتشاردز.

٥- موجز تأريخ النظريات الجماليه. م. أوفسيانيكوف- ص ٣٢٢,٣٢١.

٦- دیوانی -دیاری- ل ٧٧- کامەران.

٧- دیوانی-ئاگر و ژیلە- ل ٨٤- کامەران.

٨- دیوانی -گوڵ ئەستێرە- ل ٦٠- کامەران.

٩- دیوانی -گوڵ ئەستێرە- ل٨٣.

١٠- ئاگر و ژیلە -ل٦٠.

١١- دیاری -کامەران-ل ٥٧-

١٢- ئاگر و ژیلە ل٨٤ -کامەران.

١٣- زەبری هۆنراوە -کامەران ل ٦٢٨.

١٤- زەبری هۆنراوە -کامەران ل ٦٨.

١٥- زەبری هۆنراوە -کامەران ل ٦٩.

# سبەینێ و دووبارەبوونەوە

ئەم نووسینە بریتییە لە لێکۆڵینەوەی شیعرێکی شاعیر -دڵشادی عومەر کاکی- بەناوی: سبەینێ و دووبارەبوونەوە

## بەشی یەکەم

ڕەنگە ناونیشانی ئەم شیعرە لای خوێنەر جێگەی پرسیار، ڕامان بێت کە داهێنان پێچەوانەی دووبارەبوونەوەیە و ئایا لێرەدا چۆن ئاوێتەی یەکتری بوون؟! بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە واتایەکی -هێرا کلیتس-ی فەیلەسووف دەکەینە سەرەتای باسەکە وتوویە «یاسای گۆڕان پوختە و گەوهەری هەموو شتێکە. هەموو شتێك ئەگۆڕێ تەنها یاسای گۆڕان خۆی نەبێ»(۱)

واتا گۆڕان پێچەوانەی دووبارەبوونەوەیە. چونکە دیارە لەو دووبارەبوونەوەیەدا گۆڕان نییە. لەم یاسا فەلسەفییەوە ئەگەر بێینە سەر باسی شیعر و دنیا فراوان و پڕ نهێنییەکەی. هەمیشە کە شیعرێك دەبینین ڕەنگە بپرسین هەتا چەند سەرنجی ڕاکێشاوین ئەگەریش گۆڕانی تیایە لە چاو شیعری شاعیرانی کەدا. ئایا گۆڕانەکە داهێنانە یان نا؟

چونکە هەموو گۆڕانێك لە ناوەڕۆك و ڕواڵەت و دیاردەکاندا نابێت بە داهێنان. بگرە دووبارەبوونەوەیە هەندێ جاریش بەرەو پاشەوە گەڕانەوەیە، شیعریش کە یەکێکە لە هونەرە بەرزە مرۆڤایەتییەکان دەتوانین داهێنانە شیعرییەکانی پێ بسەلمێنین. یەکێك لەوانە شاعیر -دڵشادی عومەر کاکی-یە، ئینجا بەلای منەوە -دڵشاد و هەموو هاوڕێ شاعیرەکانی بەتایبەتی ئەوانەی کە دواڕۆژێکی گەشی شاعیریەتیان تێدا ببینرێت ئەرك و کارە هونەرییەکان گەلێك دژوار و قورسترە لە شاعیرانی پێش خۆیان. بەتایبەتی لەم سەردەمەدا کە ئاسۆی ڕۆشنبیری فراوانتر بووە بەهۆی وەرگێڕانی کتێب لە هەموو زمانەکانی دنیاوە هۆیەکانی گەیاندن وەك گۆڤار و ڕۆژنامە و تەلەفیزیۆن - ڤیدیۆ و - سەتەلایت و ...هتد ئەمە جگە لەوەی کە شاعیرێکی وەکو دڵشادی عومەری کاکی بە بڵاوکردنەوەی چەند شیعرێك کە ترووسکەی دواڕۆژێکی گەشیان تیایە زیاتر بەر پرسیارە ئەرکەکەی قورسترە لەلایەك دەبینێ دەنگی ئەوەندە بەهێز و گەورە بێت بتوانێت لە دەنگی شاعیرەکانی پێش خۆی -ئەوەی پێشوو-تێپەڕێنێ. لەلایەکی کەوە هەر لە

سەردەمەکەی خۆیدا گەلێك دەنگی وەك خۆی یاخود لە ئاستی خۆیدا هەیە و دەبینێت لە هەوڵی ئەوەدا بێت کە چۆن هەنگاوی لەوان گەورەتر بنێت. ئەو چەند شیعرەی دڵشاد کە لەم دواییەدا بڵاوی کردنەوە ئەوە دەهێنێت ئەوەندەی پێویست بێت چەند تیشکێکیان بخەینە سەر لە پێش ئەم نووسینەی مندا مامۆستا حسێن عارف لە گۆشە تایبەتییەکەی خۆیدا چەند سەرنجێکی لەبار و شیاوی سەبارەت بەشیعری -کزەی شیعری ئەم شاعیرە نووسیوە. شیعرەکەی سەرنجی مامۆستا حسێن عارفی چیرۆکنووسی ڕاکێشابوو بەتایبەتی لە ڕووی زمان و مۆسیقای شیعرەکەوە ئەمە بووە هۆی ئەوەی منیش دووبارە تەماشای ئەو شیعرە و چوار پێنج شیعری بڵاوکراوەی تری بکەمەوە. لە ڕاستیدا شیعرێکی وەکو -سبەینێ و دووبارەبوونەوە- توانیویەتی تەنکیدی حاڵەتێکی زۆر مرۆڤانە بکات کە هەرگیز لە خۆشەویستیدا دووبارەبوونەوەی لە نرخ و بەهای ئەم خۆشەویستییە کەم ناکاتەوە، ئەوەی کە زیاتر سەرنجی منی ڕاکێشا ئەوەبوو کە بەیەکجار خوێندنەوە ئەگەر سەبارەت بەناوەڕۆکی شیعرەکەش بێت لە هەموو لایەن و سووچێکی دنیای شیعرەکە بەڵەد نەبووم و هەستم کرد دەبێ چەند جار بیخوێنمەوە. لە سەرەتادا دەنگی شاعیر دەبێتە دوو دەنگ. ئەو دوو دەنگە یەکتر تەواو دەکەن و دەبنە یەك دەنگ پێشتریش بەرامبەر دیاردەی دووبارەبوونەوەکە تووشی ترس و سام و ڕامان دەبێت هێڵێکیان دەنگەکەیە و ئەوی کەیان حاڵەتی دووبارەبوونەوەی ڕووداوەکەیە کە دەنگەکە لێوەی خولقاوە.

دەترسم!
لە ترسی
دووبارەبوونەوە
بپرسی!
دووبارەبوونەوە
بپرسی
یەکجارە، بۆچوینە
دەستی گەردوونەوە؟!
گەر
لەسەر چاوەکەی هەر

ئازاریٚ ڕاوەستم
من نیوەی
دەنگی تۆم(٢)

زۆربەی شیعرەکانی دڵشاد و هاوتەمەنە شیعرییەکانی بریتین لە شیعری لیریکی -غنائی- ئەو شیعرانەی کە تۆخترین ڕەنگ تیایاندا واتا خاسیەتی بنەڕەتی ئەوەی کە یەک دەنگی تیادایە ئەویش دەنگی شاعیرە هەمیشە بانگ یاخود- مخاطبەی- بەرامبەرەکەی دەکات کە بۆتە کەسی دووەم لە هەمان کاتدا سەرچاوەی ئیلهام و هەژانی دەروونی لەلای شاعیر دڵشاد- کە هەردوو لای کێشەکەی بەدوو دەنگ داناوە لە ڕاستیدا کێشەکە هەمووی هەر دەنگی خۆیەتی و ئیتر خۆشی دەبیٚ بەنوێنەر و خوڵقێنەری دەنگی دووەم نابیٚ ئەوەشمان لە یاد بچێت کە لم سەردەمەدا بەچەشنیٚ ئەم جۆرە شیعرانە زۆربوون خەریکە مەترسییەکی کوشندە بۆ کاروانە مەزنەکەی شیعر دروست دەکات. شیعری لیریکی هەرچەندە سۆز و هەژانێکی دەروونی و بانگی خۆشەویستی و بەیەک گەیشتن و دوارۆژی گەشی تیایە بەلام لەبەرئەوەی سیفەتەکانی- زاتی ڕۆمانسی هەناسە کورتی و کورتە شیعری تیایە و بەگشتی سوود لە ئەفسانە و داستان و ڕەمز و دەمامک وەرناگیریٚ ئیشارەتدان بۆ هونەری گەورە و ڕووداوی گەورەی تێدا نییە و درامای تیادا لاوازە. لەبەر ئەم هۆیانە ئەم جۆرە شیعرانە پێویستییان بەخەرجکردن و دابینکردنی ڕۆشنبیرییەکی باش و پتەو نییە زیاتر هەڵچوونی کاتی و خودی کەم خایانە.

لێرەدا لە ڕوانگەی ئەم شیعرانەی دڵشاد تکای ئەوە دەکەم کە ئەم دەنگانە گوڕ و توانایان هەیە و ئەو توانایانە ئەگەر لە بابەتی گەورەدا خەرج بکریٚ باشترە و زەمینەیەکی فیکری توانای ڕۆشنبیرییەکی فراوان بۆ شاعیرەکە دروست دەکات و لە هەمان کاتدا ماوە و جێگایەکی فراوان و بیٚ سنوور بۆ ڕەخنەگر و لێکۆڵەرەوە ساز دەکات هەتا زیاتریان لە بارەوە بنووسێت و زیاتر کەشفی توانا و داهێنانەکانیان بکات کە دەگەڕێینەوە لای شاعیر دەبینین دوو وێنەی بەرانبەر یەک ڕاگرتووە. خۆی و ئەو -خۆی.

(پرشنگی نێو چنگی
ئازاری هەر شەویٚ
نەبێتە ئاونگی
سەر سنگم خەوی لیٚ ناکەویٚ)

ئەو: کەلای شاعیر دەبێ بە -تۆ-
(تۆش لەبەر دەرگای هەر ساڵێکدا ڕاوەستی
نەخەونی بەر خۆری
ڕۆژانی مناڵی
دەگاتە نێو دەستی سبەینێ
نەتەونی خەیاڵی
دەرگای ژەنگ لێ نیشتوو
دەبێ بەبرووسکەی ساڵێ کە دەیگەیێنێ

شیعرەکەش بەوپەڕی توند و تۆڵی یەکێتی بابەت- یاخود یەکدگیریە وە بەنەرمە ڕەوتی خۆی دەڕوا و گەلێ دیمەنی شار و تابلۆی ڕەنگینمان نیشان دەدات لەو شارە دیمەن و تابلۆیانە دەنگ و مرۆڤ و شتەکان بەیەکدا دێن و دەچن. ئەبێ بەکارەساتێکی تراژیدی. لە ئەنجامی ئەم ڕووداوانەدا شاعیر شەقڵ و سیمای (سبەینێ) دەدۆزێتەوە ئەوە ئیسهات دەکا کە دەبێت یا بمرین و لە بیر ڕۆژگار بچینەوە یاخود- ورشەی دەروون-مان ببەخشینە ناو جەرگەی ئەو تاریکییە و نەهێڵین دێوە ترسناك و تاوانبارەکان لەو تاریکییە زیاتر سوودمەند ببن بڕوانە.

سبەینێ
ئەو ڕۆژەی بەتەنها
سبەینێ دەیگەیێنێ
دەبێ هەر
لاشەی مردوومان
یا ورشەی دەروونمانی بەینێ

لە سەرەتای ئەم نووسینەدا باسی دووبارەبوونەوەمان کرد و ئێستا شاعیر چۆن مامەڵەی لەگەڵ دووبارەبوونەوەدا کردووە.

لای شاعیر هەر دووبارەبوونەوەیەکی ئەو حاڵەتەدا بەخشین و دابینکردنی زیاتر خۆشەویستی هەیە بگرە هەر دووبارەبوونەوەیەك لای ئەو بارێکی ئیجابی و گۆڕانە ئینجا کە گۆڕانەکە تەواو پێداویستییەکانی گۆڕان و بەرەو پێشەوەچوونی خۆی دابین بکات ئەوا دەبێتە داهێنان چونکە گۆڕانەکە دووبارەبوونەوەی یەك حاڵەت نییە. ئەگەر

وەها بوایە نەك هەر ئەسوار ڕەنگی کاڵ دەبووە بەڵکو هەر تەواو دەمرد.

ئەوانەی دووبارە خۆشەوێ
یەکجارەی مردنەو
دووبارەی ژیانەو
چەند جارەی ئەوەندەی لە دامێنی تاڵی سبەی دا.
(کە تۆ هەی
وەك سبەی دیسان تۆ
جوانترین دووبارەبوونەوەی)

لە پێش ئەمەشدا دڵشادی شاعیر هیوای بەو دواڕۆژەی هەردووکیان بەڕاشکاوی دەربڕیوە و سیفەتەکانی خاوەنی ئەو هیوا گەورەیەی لە دوو وشەی -نەمردن -نەمری -نەسرەوتن -تێکۆشان-دا بەرجەستە کردووە دواڕۆژی گەشی کردووە بە موڵکی ئەوانەی هەردەم هەنگاو دەنێن و لەسەر دوێنێ و یادگارەکانی ناژین. ئێستا هەردووکیان -من و تۆ- وەك -ڕەنگ و دەنگ- لە دووبارەبوونەوەدان لە گۆڕان و لە چاوەڕوانی ئەو -سبەینێ-یەدان. کە ئەخشێکی لەمڕۆ باشتر و ژیانێکی ئارام و مسۆگەر بۆ هەمووﻻ بخووڵقێنێ. ئەمە زیاتر ناوەڕۆکی شیعرەکە بەهێز دەکات و سەرجەمی شیعرەکە دەبێتە هۆ وەسیلە- بەهەموو مانایەك دەبێتە هادف- بۆ مەسەلە و مەبەستێك. یەکێ لە خاسیتەکانی بنەڕەتی و سەرکەوتووانەی شیعری کوردی لە مرۆماندا دەبێ هۆ بێت بۆ بەئەنجام گەیشتنێك شاعیر شتێکمان پێ دەڵێت کە هەیە و زۆرکەس ئەو بوونە نابینن تەنانەت پێویستی بوونیشی ناسەلمێنن. بەبێ ناوەڕۆك بێ فیکر و ڕێباز ڕێگای نەگرتووەتەبەر. دەیەوێ هەموو شتێك بەسەلیقەی وردی شاعیرانە لە یەك شتدا کۆبکاتەوە و ئێمە و ئەو باشتر لە یەك بگەین. بەلای منەوە شیعر پەیامێکی خۆی پێ نەبوو وەك مرۆڤێك وایە بێ جیهان و بێ چاو و بێ دڵ بێ ناو و ناسنامە.

لێرەدا دیسانەوە دووبارەبوونەوەی دەنگ و ڕەنگ و نەسرەوتنەکە نیسهات دەکات و دەبێتە خاوەنی پەیام.

(من و تۆ
دووبارەبوونەوەی
دەنگین

ڕەنگێکین چوونەوەی
گرانە و دووبارە
ئەوەی کە چاوەڕێی ڕۆژگارە
نامرێ و ناسرەوێ
ئەوانەی دووبارە خۆشمەوێ)

## بەشی دووەم

لە چەند شیعرێکی ئەم دواییەی شاعیردا و بەتایبەتی لەم شیعرەدا کە ئێمە لە بارەیەوە دەنووسین. تەواو هەست بە-یەکێتی بابەت- دەکەین لە شیعرەکەدا. بەپێچەوانەی گەلێ لەو شیعرە -لیرکی-یانەی ئەم سەردەمە کە دەیانخوێنینەوە وە هەست بەپچڕان و لاوازی یەکێتی بابەتەکە دەکەین تەنانەت لە هەندێکیاندا ئەگەر کۆپلەیەك و دووانیش دەربێنین لە ناو مەساری شیعرەکە ناگۆڕێ و تێکی نادات. لای دڵشاد بەجۆرێك واتاکان باوەشیان بەیەکدا کردووە و ناوێتەی یەکتر بوون کە هەرگیز ناتوانین لە یەکتریان دابڕین و لێی دەرهاوێژین. بەلای منەوە ئەوەی زیاتر توندوتۆڵی بابەتی شیعرەکە و یەکدگیرییەکەی پاراستووە ئەو ئیقاعە مۆسیقییە نەرم وە لەسەرخۆ و نەپچڕاوەیە کە لە ناوەوەی شیعرەکەدا بەئاسانی دێتە گوێ دیارە کە مۆسیقای ناوەوەی شیعر چەندە گرنگە و چۆن لەلایەن شاعیرە گەورەکانەوە گرنگی تەواوی پێدراوە تەنانەت ئەم مۆسیقای ناوەوەیە کارێکی وەهای کردووە بوونی -قافیە- بەهیچ جۆرێك لەو شیعرانەدا پێویست نەبێت و هەر هارمۆنییەتێ کە وشەو واتاکان دروستی دەکەن خۆیان دەبن بە کێش بۆ شیعرەکە و قافیە بوون و نەبوونی وەك یەکی لێ دێت ئەوەی لەم شیعرەدا سەرنجی ڕاکێشام ئەوەیە کە سەراپای شیعرەکە -سێ هەنگاوییە. ئەم جۆرە کێشە خۆماڵییە کە بنەڕەتەکەی کێشێکی سادە و لەباری فۆلکلۆری کوردییە توانیویەتی بەشێوەیەکی زۆر سروشتی ئەو ئیقاعە یاخود ئەو مۆسیقا هێمنەی ناوەوە ببەخشێتە شیعرەکە بڕوانە ئەو چەند بڕگەیە:

گەر ١-١

لەسەر=١،٢+٢=٣

چاوگەی هەر =٣

ئازاری ڕاوەستم=٣٠٣

من نیوەی=٣

دەنگی تۆم=٣

مەبەستم=٣

هێندەیە=٣

لە دامێنی تاڵی=٤+٢=٦ ٦+٢=٣

سبەی دا کە تۆ هەی=٣+٣

دیسان تۆ=٣

جوانترین=٣

دووبارە=٣

بوونەوی=٣

ئەم کێشەی سێ برگەییە کە بەتەشکیل بوونی هونەری ئەو مۆسیقانا و خۆییبەی بەخشیوە بە شیعرەکە ڕەنگە ئەگەر پارسەنگی یاخود لەنگەری قافیەکانیشی لە تەکدا نەبوایە هەر دەوری خۆی ببینیایە و هیچی لێ کەم نەبووایەتەوە بەڵام شاعیر بەو لەنگەرانە واتا بەو قافیانە گەلێ وشەی سادە و خۆش باودا دروستی کردوون نەیتوانیوە چوارچێوەیەکی یاخود بڵێین نەخشەیەکی ڕەنگین لەسەر تەختی شیعرەکە دامەزرێنێ لێرە دەگەینە ئەوەی کە ئیقاعەکە بەهۆی مۆسیقا ناوخۆی و لەنگەری قافیەکانەوە دروست بووە چونکە (ئیقاع بەتەنها لە خۆیەوە دروست نابێت ئەگەر هۆکارێکی گۆڕانی ئامێز یاخود مۆسیقایی نەچێتە پاڵ و تەبایی و گونجاندنەکە دروست نەکات)(٣) لەلایەکی تریشەوە تەماشا دەکەی ئەم مۆسیقای ناوخۆیی و کێشە ئاسانە لە وشەی زۆر سادە و ساکار و خۆماڵی سەر زمانی خەڵکی دروست بووە. کە ئەمەش خۆی یەکێکە لە سیفاتەکانی شیعری لیریکی. لەم بارەیەوە هەر لە سەردەمی شاعیرە ڕۆمانسییەکانەوە بەتایبەتی-وردزورس و کولرج- بیروڕای وەك یەك و جیاواز پەیدابووە هەتا دەگاتە شاعیرە گەورەکانی ئەم دواییە و وەك ئەلیوت و ئەزراباوند-(تەنانەت -ئەلیوت- لە یەکێ لە بەشەکانی وێرانە خاك-دا هەر بەو زمانە سادەیە شیعرەکەی داڕشتووە(٤) لە هەمان کاتیشدا (نرخ و بەهایەکی هونەری وەهای داوەتێ کە هەر لەو زمانە ئاساییەی خەڵك بژارەی کردووە و بەرەو بەرزی بردوویەتی(٥).

لێرەشدا خاڵێکی گرنگتریش هەیە کە بریتییە (لە چڕکردنەوەی مانای ئەو شەو واتایانە)(٦) و دەست بڵاوی نەکردن لە بەکارهێنانیاندا بڕوانە لەنگەری قافیەکان و سادەیی وشەکان و چڕکردنەوەی مەبەستەکانیان لەم چەند نموونەیەدا. نەبێ ئەوەش

بزانین ئەم شیعرەی دڵشادی عومەر کاکی یەکێکە لەو شیعرە دەگمەنانەی ئەمڕۆکە -تدویر-ی مۆسیقای تیا بەکارهێناوە. شیعری -مدور- مودەوەر کە حاڵەتە کپ و هەڵچووەکان تیایدا تەواو -هارمۆنی-دەبن. زیاتر بەڵگەی توندی بابەت لەناو ئەو شیعرەدا ساخ دەکەنەوە.

(سبەینێ ئەو ڕۆژەی بەتەنها
سبەینێ دەیگەینێ
دەبێ هەر
پالاشەی مردوومان
پاورشەی دەروونمانی بەینێ گەر
لەسەر
چاوگەی هەر
ئازارێ ڕاوەستم
من نیوەی دەنگی تۆم
مەبەستم. هێندەیە
پڕشنگی
نێوچنگی
ئازاری هەر شەوێ
ئەبێتە ئاورنگی
سەرسنگم. خەوم لێ ناکەوێ

## بەشی سێیەم

### وێنە شیعرییەکانی سبەینێ و دووبارەبوونەوە

لە کاتێکدا کە باسی بنەما و ستوونە سەرەکی و بەهێزەکانی شیعری نوێ دەکرێت. سێ بنەما و ستوونی سەرەکی خۆیان دەنوێنن، یەکەم -زمان، دووەم-مۆسیقا، -سێیەم-وێنەی شیعری و ئەوەندەی کە لە ناوەڕۆکی هەتر شیعرێکەوە نزیکە ئەوا دوو ئەوەندە پەیوەستە بەفۆڕمی شیعرەکەوە و، بەشێکی گەورەیە لەلایەنی جوانکاری و وردەکاری و ڕازاندنەوەی سیمای شیعرەکە وێنەی شیعری فریای دەربڕینی زۆر حاڵەتی هەڵچوونی دەروونی شاعیر دەکەوێت و لە گرفتێکی دژوار ڕزگاری دەکات، وێنەی شیعری لەم

شیعری دڵشادی عومەر کاکی دا فریای ئەو هەست و هەژانە پەنگ خواردوانەی دەروونی کەوتووە و لەسەر لاپەڕەکەی بەردەمیدا نەخشی خۆی داناوە. شاعیرە گەورەکانی جیهان و لای خۆشمان بەتایبەتی لای گۆران. وێنەی شیعری لە سەرووی گەلیٚ لە هونەرکاریەکانیەوە دەردەکەوێت. بۆ نموونە ئەگەر شیعرەکانی بەدر شاکر سەیاب بخوێنینەوە دەبینن کە سەیاب (سوودێکی زۆری لە ڕووی وێنەی شیعرییەوە وەرگرتووە لە شاعیر گەورە جیهانییەکان. لە شیعرەکانیدا یا کاریگەری ئەلیوت ئەدۆنیس و ستویل و ناظم حکمت و کارسیا لۆرکا و شکسپیر و بابلو نیروداو گۆتییە دەدۆزیتەوە تەنانەت لە وێنەی شیعردا سوودی لە هونەرمەندە گەورەکانیش وەرگرتووە وەك نەخشاندنی وێنەی -دون کیشوت- کە لە ڕۆمانی -دون کیخوتە-ی سرڤانتسیە-وە وەری گرتووە[٧] لە شیعرەکانی ئەم شاعیرەدا کە هەموو لیریکی و کورتە شیعرەدا وێنەکان زۆر یارمەتی دەربڕین و بەرجەستەکردنی خەیاڵی شاعیریان داوە و شاعیریش توانیویەتی ئەو وێنە شیعرییە (زەمنیانە)ی هەیبووە بەرجەستەی بکات و وێنەی جوانی لیٚ پێك بهێنیٚ هەندیٚ بەم کارە دەڵێن ڕاوکردنی وێنەی یاخود وێنەکردنەوەی وێنەی سروشت و دیاردەکان کە تابلۆ شیعرییەکەی خۆیدا بەپێی زەوقی شیعر و توانا و چێژ و فەلسەفەی ژیانی دووبارە نەخشە دەکێشێتەوە لێرەدا توانای هونەری خۆی دەنوێنیٚ چونکە هونەر وەرگرتنی وێنەکان نییە. بەڵکو هونەر چۆنێتی وەرگرتن و بەکارهێنان و دروستکردنەوەی سەرلەنوێی وێنەکانە:

من و تۆ
دووبارەبوونەوەی
ئەو تەمەی
گرانە چوونەوەی
ئەو غەمەی
ئاسمانی ساماڵی
لیٚ گرتین
ورنە خۆری شەوی
چەند ساڵی
گوڵ چنی ئاسمانی ڕاماڵی
بەینیٚ

نه تەونی خەیاڵ
دەرگای ژەنگ لێ نیشتوو
دەبێ بە برووسکەی
ساڵێ کە دەیگەیێنێ
سبەینێ
ئەو ڕۆژەی بەتەنها
دەبێ هەر یا لاشەی مردوومان
یا ورشەی دەروونمانی بەینێ

لەم شیعرەوە ئەوەی لە بارەیەوە ڕوونمان کردەوە دەگەینە ئەنجامێك كە ئەم شاعیرە لاوە ئێستا وەك دەنگێك كە لە دەنگە زوڵاڵ و ڕەسەنەکانی شیعری ئەمڕۆی کوردی ئەگەر لە ڕووی خوێندنەوە و خۆ خەریك کردنەوە وەك هەوڵێکی سەرەتاییش بێت ڕەنگە کارێکی باش دەرهەق بەجێگاو توانای شیعری خۆی ئەنجام بدات چونکە توانایەکی گورج و گوڕ و خەیاڵێکی شاعیرانەی وردی هەیە. ئەمڕۆ لە ئەدەبی کوردیدا کورتە شیعر و شیعری لیرکی و یەك دەنگی و یەك مەبەست زیاتر لە پێویست بەزیانی سەردەمەوە زۆر بووە. دەنگی شیعریی باش کە زۆر کەمە و لەو جەنجاڵی بازاڕە گەرم و قەڵەباڵغەدا ون بوون بۆیە ئەمڕۆ لە هەموو کات زیاتر ئەم شاعیرە و هاوتەمەن و هاو ئەزموونەکانی پێویستییان بەخۆ پەروەردەکردنێکی زۆرە و دیارە ئەمەش لە توانا و تاقەتی زۆریاندا نییە و دوور نییە زۆریان یا لە سەرەتا یا لە نیوەی ڕێگادا بکەون. بۆیە بەلای منەوە ڕووکردنە شیعری درێژ و درامی و سوود وەرگرتن لە کەلەپوور و ئەفسانەی کوردی کارێکی لە هەموو کات زیاتر پێویستە.

سەرچاوەکان:

١- شیعری سبەینێ و دووبارەبوونەوە دڵشاد عومەر کاکی هاوکاری ژمارە ١٠٢٦
٢- هەموو ئەو کۆپلە شیعرانە لە هەمان شیعرەوە وەرگیراون
٣- فلسفة الادب والفن-د. كمال عيد ص ٥٥
٤- التجربة الخلاقة س. بورا ص٢١٥
٥- الشعر والتجربة ارشيبالدماكلش، ترجمة سلمى خضراء الجيوسي.
٦- الرؤيا الابداعية: هاسكل.

# شێوە لە شیعری نوێی کوردی-دا

## هەنگاوی یەکەم:

فۆرمی شیعر بزووتن و گۆڕانە لە دایکبوونێکی هەمیشەییە، فۆرمی شیعری زیندوو ئەوەیە هەمیشە لە تەشکیل بوونێکی بەردەوامدا بێت.[1] لەو کاتەوەی کە پەیوەندی مرۆڤ و شیعر پەیدابووە هەتا ئێستا شیعر و شێوەی شیعر قاڵبی شیعری و کەرەستە جۆر بەجۆرەکانی لە گۆڕان و پێشکەوتنێکی بەردەوامدان، وەستانیان نییە، ڕەنگە لای شاعیرێك، سەراپا، یاخود بەزۆری یەك شێوە، قاڵبە شیعرێك خۆی دووبارە بکاتەوە، چەند مەبەستی جیاواز بەشێوەیەکی لە یەکچوو- وەك یەك- دووبارە ببێتەوە، بەڵام یاسای گشتی شێوە وەك یاسای گشتی ژیانە، لە شێوەیەك و قاڵبێکدا نامێنێتەوە، هەمیشە دەگۆڕێت و پێش دەکەوێت. لێرەدا مەبەستمان لە گۆڕان و پێشکەوتنی شیعری نوێی کوردییە کە ئەمەش دەڵێین ناتوانین ڕاستەوخۆ بێینە سەر شێوەی دارشتن و شیعر نووسینی ئەمڕۆ چونکە ئەم قاڵبە شیعری و شێوەی شیعر نووسینەی ئەمڕۆ لەپڕێکا و بێ ڕابوردوویەکی دوور دروست نەبووە، یاخود نەتوانین بڵێین زادەی چەند قۆناغ گۆڕانکارییە لە شێوەدا. هەر قۆناغێك تاقیکردنەوەیەکی نوێیە وە هەرگیز شێوەی یاخود زمانێکی کۆن ناتوانێت تەعبیر لە تاقیکردنەوەیەکی نوێ بکات لەبەرئەمە دەبێت شاعیر هەوڵ بدات زمانێکی نوێ، ڕوخسارێکی نوێ قاڵبە شیعرێکی نوێ بدۆزێتەوە هەتا لە دوو لایەنەوە بتوانێ جێگەی خۆی لە ڕیزی شاعیرەکانی سەردەمەکەی خۆیدا بکاتەوە و بگرە هەوڵیش بدات لەوانیش تێپەڕێ و خاوەن دەنگ و تاقیکردنەوەی خۆی بێت. ئەو دوو لایەنەش بریتییە لە:

یەکەم: کەرەستەکانی شێوە لای ئەو کەرەستەی کارکراو و پاشماوەی شاعیرێکی تر نەبێت. واتە لە حاڵەتی هەمیشەیی دامێناندا بێت. بچێتە دنیای نوێ و هاوچەرخێتییەوە چونکە هاوچەرخییەتی بریتییە لە توانای هونەرمەند لە هەنگاونان و تێپەڕیندا.[1]

دووەم: شێوە ببێتە هۆی نزیککردنەوە و ڕوونکردنەوە و بەهێز و پێزکردنی ناوەڕۆك لای شاعیرەکە. شێوە بەرجەستەی ناوەڕۆك بکات بەڵام خۆی وەك سەرپۆش یاخود

تارایەکی ناسك و ڕووپۆشێکی زۆر تەنکی بووکێك بێت، وەك ناظم حکمت دەڵێت، «من بەش بەحاڵی خۆم دەمەوێ شێوە بەجۆرێ لەگەڵ ناوەڕۆك و خۆیەتیدا بگونجێنم و جۆشیان بدەم کە ناوەڕۆك و خۆیەتییەکە دوو هێندەی دیکە ڕوون بکاتەوە، بەڵام شکڵەکە خۆی ڕوون نەبێ.

**هەنگاوی دووەم:-**

شێوەی باوی شیعری کوردی لە کۆنەوە شێوەی کێشەکانی هیجا -فۆلکلۆر- بووە، بەتایبەتی ئەو گەنجینە گەورەیەی شاعیرانی ناوچەی هەورامان و زەنگەنە بۆیان بەجێ هێشتووین هەموو لە شێوەدا ئەو کێشانەن و دیارە کە جووت قافیە -مەسنەوی- ن. بەڵام بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیری لە کوردستاندا بەتایبەتی ڕۆشنبیری ئیسلامی و تاوسەندنی بەحرەکانی شیعری عەرەبی -عروزی عەرەبی- لەلایەك و هەڵکەوتنی زۆربەی شاعیرە کلاسیکییە کوردەکان لەو جیهانە ئاینییەدا. بووە هۆی ئەوەی شێوەی شیعری کلاسیکی کوردی یەك قالب وەربگرێت. بەڵام لە سەرەتای چەرخی بیستەم و بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار بەزمانی کوردی وە پەیوەندی پەیداکردن لەگەڵ ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا ڕاستەوخۆ بووە هۆی گۆڕانی قالبی شیعری کلاسیکی کوردی، زۆر لە شاعیرەکان گەڕانەوە سەر کێشی خۆماڵی کوردی. لە گۆڤاری -ژین- ی ئەستەمول دا کە ساڵی -١٩١٨-١٩١٩- دەرچووە، چەند شاعیرێکی کورد لەوێدا یەکەم تاقیکردنەوەی خۆیان دەست پێکرد وەك -عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری- کە ئەمە نموونەی یەکێ لەو شیعرانەیەتی کە جۆرە هەوڵێکی لە گۆڕانی قالبە شیعرییەکەدا بەدی هێناوە:

(طبیعت صامت و لاڵە...

ژخملان، ڕوح، جان والە

تنێ، دەنگەك

عجائب بلبلە دکالە؟...

تەگوو بلبل دگت ئەفغان

نەخێر

ئەو نعرەیا لاوان)

لە ساڵی -١٩٢٠- بەرەو ژوور کۆمەڵێ شاعیر و ڕۆشنبیری کورد ویستیان شیعری دەقگرتووی کوردی لە قالبی کۆنی چەند ساڵەی بێننە دەرەوە و گیانێکی نوێی بکەن

بەبەردا کە شیاوی سەردەم و تەکنیکی نوێی بەدیهاتوو لە ئەدەبیات و شیعری ئەورووپاوە بێت. کۆمەڵێ شاعیری لاوی ئەو سەردەمە کە زمانی تورکی یاخود ئینگلیزیان دەزانی بەتایبەتی گۆران و ڕەشید نەجیب و شێخ نووری ئاگاداری شێوەی نوێی شیعری تورکی و ئەورووپی بووبوون یاروەزخێکی نوێیان بۆ شیعری کوردی سازکرد. شیعری کوردی ئەوەندەی لە ناوەڕۆکدا نوێ بووەوە ئەوەندەش لە شێوەدا هاتە پێشەوە. ئەگەرچی تەواو دەستبەرداری کێشی پارسەنگی دوو نیوە دێر و جووت قافیە نەبوون بەلام جۆرە هەناسە و دابەشکردنێکی نوێیان خستە نێوان دێر و نیوە دێرەکانی شیعرەکەوە هەروەها قافیەکانیش کەمێك لە یەکتری دوورکەوتنەوە و هەناسە و ئیقاعی تێ هەڵکێش کەوتە نێوانیانەوە. ئەگەرچی پاش ئەو هەناسە و ئیقاعانە دەچوونەوە سەر یەکتری، لێرەدا بەشێك لە شیعرێکی -ڕەشید نەجیب- لەم ڕووەوە دێنینەوە کە ساڵی -١٩٢٦- نووسیویە:

(ئەوقاتێ ئەبێ، ڕوحم ئەکا تەرکی مەکانی
وەك تەیری جیهانی
هەروەك، کە وەرس بوویێ،
لە دیداری حەقیقەت،
یەعنی، کە، لە زات
تەسلیمی خەیالاتی ئەکا
دەستی عەنانی
قەسدەن ئەیەوێ دەرچێ لە دونیاو لە خەلیقەت
ئەو وەختە، لەسەر باڵی، دلاوێزی، خەیالات
هێندە دەفڕم، تاکو دەبم خارجی عالەم)(٠)
...هتد

ساڵانی سییەکان، ساڵانی شۆڕشی نوێی شیعرەکانی -گۆران-بوو. لە پەنجاکاندا -کامەران و دیلان هەردی و -ع.ح.ب- هەریەك بەشێواز -ئوسلوب-ی نوێی خۆیەوە هاتە پێشەوە. کامەران و دیلان لە سەرەتادا شیعری سەریەست-یان دەنووسی و بگرە لە پەنجاکان و شەستەکانیشدا من گەلێك لە بەرهەمی بڵاوکراوەیانم، بەتایبەتی -لە ڕۆژنامەی ژین-دا بینیوە، بەلام ئەمان وردە وردە دەستبەرداری ئەو شێوە زۆر نوێیە بوون و چوونەوە سەر شیعری جووت قافیە و کێشدار -موزون و مقفی- وەك کامەران لە یەکێ لە نووسینەکانیدا باسی ئەم ڕاستییەی کردووە.

## هەنگاوی سێیەم:-

بەپێی ئەو بارودۆخەی لە کوردستانی عێراقدا بەدەرچوونی بەیانی یانزەی ئازاری -١٩٧٠-هاتە پێشەوە، دەبوا بارودۆخێکی نوێ لە شیعردا، لە جۆری دەربڕینی شیعردا، لە کەرەستەی بەکارنەهاتوودا، واتا -لە شێوەدا- بێتە پێشەوە. نابێ ئەوەشمان لە یاد بچێت کە ئەو بارودۆخە درێژبوونەوە و پەرەپێدانی باری زاتی و مەوزووعی شیعری کوردی بوو لە پێش ساڵی -١٩٧٠-دا. ئەو بارە نوێیە دەبوا شیعری نوێی خۆی هەبێت هەتا بتوانێت زمانێکی نوێ -کە تاقیکردنەوەیەکی نوێ بوو- تەعبیر لەو دیاردە و ڕووداو و بارە نوێیە بکات. شاعیرەکان هەستیان بەهاوار و بانگەوازێکی نوێ دەکرد لە ناخیاندا. لە ناوەوەیاندا گەلێ مەسەلە هەبوو هەندێکیان پێویستییان بەوە بوو کە بتەقنەوە قەوارەی خۆیان لە تابلۆکەدا جێگە بکەنەوە ببنە ڕەنگێکی نوێی زاڵبوو بە سەرانسەرییەوە چونکە ئەو کەسانەی لە ناو نەتەوەدا بزووتنەوەی نوێخوازی بەرپا دەکەن و شێوەی نوێ دروست دەکەن ئەوانە کە هەست بەدەنگ و داخوازییەکی ڕۆحی دەکەن لە ناخیاندا بانگیان لێدەکات هەتا ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە کە هەستی پێ دەکەن[٦] ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە شیعری نوێی کوردی لەسەر دەستی کۆمەڵێ شۆڕەسواری ڕابەردا بێتە ناو کۆڕی ژیانەوە و شیعرەکان زیاتر پەل بهاوێن بۆ ناخی نهێنییەکان و ڕووناکی بخەنە سەر تاریکییەکان ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە مەودای دەربڕین و تەعبیر کردن لە شتەکان فراوانتر بوو، واتە بزووتنەوەکە -شۆڕشە نوێیەکە- تەنها لەوەدا نەبوو کە دەنگ و چەند ئیقاع و خاڵەندی و چەند ناوێکی نوێ بێتە پێشەوە و دێری جووت قافیەی نەمێنێ و نیوە دێڕەکانیش بەرانبەر یەکتری کێشەکانیان بگۆڕێن، بەڵکو بزووتنەوەکە شۆڕشە نوێیەکە لە شێوە و جۆری دەربڕیندا بوو، وەك -عەبدولوهاب بەیاتی- لە تاقیکردنەوەی شیعری خۆیدا نووسیویە. جیاوازی بیروڕا سەبارەت بەفۆڕمی شیعر لە ئارادا نەماوە چونکە نوێکردنەوە لە شیعردا شۆڕشێك نییە بەسەر عەرووز و کێش و قافیەدا وەك هەندێك لایان وایە ئەوەندەی کە شۆڕشێکە لە تەعبیردا[٧]. ئینجا شێوەی نوێ لە شیعری کوردیدا کە لە دوای ساڵی -١٩٧٠-وە هەتا ئێستا بەردەوامە وە ئەبێت لە ڕووی ئەوەوە کە گۆڕانکارییە لە شێوەداو تەعبیرێکی زاتی و مەوزووعییە لە ڕووداوەکان و لە شتە جۆربەجۆرەکان هەمووی بەشێوەیەکی گونجاو پڕ بەهەری قۆناغە مێژووییەکە هاتبێتە پێشەوە و جێ دەستی قەڵەمی لاواز و سەرنەکەوتووی تیا نەبێت، بەڵکو لەو لێشاوی تەقینەوەیەدا کە زۆر بەگوڕ هات.

گەلێکیان تۆوی مردن و نەمانی خۆی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو بۆیە هەر زوو لە سەرەتا یاخود نیوەی ڕێگادا چراکانیان کوژایەوە بەهێچەوانەی ئەمەشەوە هەندێکیان کە ژمارەیان کەمە پەیامی خۆیان گەیاندووبوونە شاعیر و کوڕی سەردەمە جەنجاڵەکەی خۆیان. ئەو یاسا شیعریانەی کە لە شێوەدا بوویبوونە پێوەند و چەندین ساڵ ڕێگای گەلێ دەربڕین و پەلوپۆ هاویشتنیان لە شاعیری کورد بەستبوو ئەمان نەبوونە کۆیلەی ئەو قاڵبانەو لەو سنوورەیان تێپەڕاند. ئەو یاساو نەریتە شیعریانە شاعیر دەکەنە کۆیلەی خۆیان و ناهێڵن ئەو تین و توانای داهێنانەی لە ناخیاندایە خۆی دەربخات(٨).

## هەنگاوی چوارەم:

شێوە لە شیعری نوێی کوردیدا بەو پێیەی کە مەودایەکی فراوان و پەل هاویشتنی زیاتر هەیە ناکاتە ئەوەی کە بزووتنەوەی داهێنان تیایدا ئاسانتر بێت لەو شیعرانەی مەودای فۆرمەکانیان کەمتر بەرفراوانە، بەڵکو ئەم جۆرە بەرفراوانی و پەل هاویشتنە زیاتر خۆ ماندووکردن و تاقیکردنەوە و ڕۆشنبیرییەکی قووڵتری دەوێت. گومانیش لەوەدا نییە کە توانا و ڕادەی ڕۆشنبیری هەر شاعیرێك لە شیعرەکەیدا ڕەنگ دەداتەوە. ئایا ئەو شاعیرە هەتا چ ڕادەیەك توانیویە لە داڕشتنی شیعرەکەیدا شێوەیەکی یەکانگیر و توندوتۆڵ بدۆزێتەوە و ئەوەی مەبەستییەتی دەری بڕێت. ئەو تەکنیکەی لە سەراپای شیعرەکەیدا لە بەرچاوی گرتووە دیارە تەکنیکیش لە چوارچێوەی شێوەدایە هەتا چەند سەرکەوتنی داوەتێ و زاڵ بووە بەسەریا؟ شێوەی نوێی شیعری کوردی لای هەر شاعیرە جیهانێکی تایبەتە وەك ئەوەی کە بچیتە پێشانگای هونەرمەندێکی تەشکیلییەوە و بتەوێ لە جیهانی هونەرمەندەکە بگەیت، بەڵێ ڕاستە کە هەموو ئەو تابلۆیانەی کە هونەرمەندەکە نیشانمان دەدات یەك بابەت و یەك ڕەنگ نییە بەلام ئێمە ئەگەر بەوردی تەماشای هەموو تابلۆکان بکەین یەك شێوە، یەك ئوسلوب و ڕێباز بەگشتی لە هەموو تابلۆکاندا دەدۆزینەوە و ئەمەش شێوەی تایبەتی -ڕێبازی هونەری- هونەرمەندەکە دەستنیشان دەکات، لە شێوەی نوێی شیعری کوردیدا بەکارهێنان و سوود لێ وەرگرتنی داستان و ئەفسانە چ خۆماڵی بێت یاخود هی هەر نەتەوەیەکی کە بێت. ناوهێنانی پاڵەوانەکانی ئەو داستان و ئەفسانەیە یاخود ئاماژەکردن بۆ کەسێکی مەزن، شاعیرێك یاخود هونەرمەندێك یاخود بەکارهێنانی بەیت یا چەند ڕستەیەکی شیعر و داستانێك، بووە بەیەکێك لە لایەنەکانی بەرەو پێشەوەچوونی شێوە. نابێ ئەوەشمان لە یاد بچێت کە ئایا

ئەو شاعیرە لە خواستنی ئەو کەرەستانەدا هەتا چەند سەرکەوتووە، چونکە بەتەنها خواستنی ئەو کەرەستانە بەس نییە بۆ ئەوەی بڵێین فلانە شاعیر زیاتر دەزانێ و ئەوەندە بابەتی گەورەی هێناوە و لەگەڵ شێوەی شیعری خۆیدا گونجاندوویەتی، بەڵکو دەبێت بزانین بۆچی ئەو باسانەی هێناوەتە ناوەوە و هەتا چەند لەگەڵ شێوەی بابەتەکەیدا دەگونجێت. شیعر لە هەموو بابەتەکانی دیکە پتر فۆرمێکی بەرجەستەی هەیە. مەبەست لە وشەی بەرجەستە ئەوە نییە کە فۆرم تەنها لایەنی ماتریالی دەرەکی -مادی- هەبێ و بەس، چونکە ئەگەر وابێ فەرهەنگێك لە دیوانی شیعرێك لاپەڕەی زۆرترە و قەوارەشی گەورەتر، نەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە ئێمە دەتوانین لە ڕێگەی هەست و نەستەوە فۆڕمی شیعر ببینین. بۆ نموونە چاوە گوێچکە لەم بوارەدا یارمەتییەکی زۆرمان دەدەن(٩). لەم ڕووەوە شاعیر -حەسیب قەرەداغی- لە شیعری -کەژاڵی جوان-دا پەیوەندییەکی توندوتۆڵی نێوان خۆی و خەمی مەولەوی و گۆران دەدۆزێتەوە. شێوەکە دەبێتە ڕەنگێکی ناوێتەبووی گونجاو لە نێوان ئەو سێ خەمە، یاخود ئەو سێ کۆستە. ناوەڕۆك شێوەیەکی قەشەنگ بۆ خۆی دەدۆزێتەوە و پەل دەهاوێت بۆ ناو جیهانێکی فراوانتر. ئەو تێهەڵکێش -تضمین-ە کە شاعیر کردوویەتی و شیعرێکی مەولەوی هێناوە و لە شێوەی شیعرەکەی خۆیدا شوێنی بۆ دیاری کردووە و ئەوەی کە لە سنووری خەمەکەی ئەودا جێی بۆتەوە و بەجۆرێك گونجاوە وەك ئەوەی کە بۆ ئەو جێگەیە دانرابێت و زیاتر شێوەی شیعرەکەی پێ بڕازێنێتەوە. ئەمە ئەو حاڵە گرنگە بوو کە پێشتر باسمان کرد. ئایا چۆن شاعیر ئەو کەرەستە هونەرییانە وەردەگرێت و چۆن بەکاری دەهێنێت؟

(کەژاڵی جوان هەر بێ دەنگە
کەژاڵی جوان زۆر بێ دەنگە
ڕووباری شێتی سۆزی من
لە ترسانا هێجگار مەنگە
دایك دەستی لەسەر دڵە
خەڵك و خوا دێن دەڕۆنەوە
هەرچی بەهێتی سەبوورییە
تۆزقاڵێ ترس

له سیهالی هەناوی من ئاشۆنەوە

شەو هاتەوە

ئەمشەو ئێجگار بێ ئامانە

لە دیوانی مەولەوییەوە شیعرێك هاتە خەستەخانە

ئەمشەو وە هەر حاڵ شەو وە ڕۆژ بە ڕوون

خوا، سا مەرگێ، سەحەر چێشکەڕوون)[10]

هەر لە هەمان شیعردا خەمەکانی گۆران و مەولەوی دێنەوە لای ئەم و لە کۆستی -کەژاڵ-دا زیندوو دەبنەوە. لەلایەك شاعیر دەبێتە دەروێشی مەولەوی و لەلایەکی تریشەوە دەبێتە شەیدای شێوەنەکەی گۆران ئەم بەکارهێنانەی شاعیر بۆ مەولەوی و گۆران گرنگییەکی تریشی هەیە کە ئیقاعی شیعرەکەی ئەم، جۆرە دابەشکردنی کێشەکان و هەناسە و دانانی قافیەی دێر و نیوە دێرەکان ئەبوونەتە هۆی ئەوەی کە ئەوەندەی شێوەی شیعرەکە برازێنێتەوە لە دەربڕینی مەبەستی تەواوی شاعیر تۆزێك کەم بکەنەوە بیهێننە خوارەوە، لای ئەم تەکنیك، شێوەی نوێ، بۆ هەستانەوە و زیاتر هاوار و دەربڕینە، زیاتر قووڵبوونەوەیە بەناخی خەمەکەدا، واتا بەناخی بابەت و مەسەلەکەدا. هەریەك لە ناوەکانی -مەولەوی، گۆران، عەنبەرخان، گوڵاڵە، لە یەك جێگەدا کۆدەبنەوە. هیچ جیاوازی نییە کە لەو ئازارە ڕۆحییەدا لەو قاڵبە نوێیە شیعرییەدا ئەم بانگی ماتەمی ئەوتراوی ئەوان تەواو بکات یاخود ئەوان لە فرمێسکی ئەمدا دوو وشەی ئازاری ڕۆح-پاش چەندین ساڵ بۆ ئەم دنیا ماتەم پۆشە بهێننەوە، بڕوانە چۆن شاعیر وشەکان لەناو دێرەکانی خۆیدا جێگا دەکاتەوە و دەبنە یەك ئیقاع.

من دەروێشی -مەولەوی-م و

شەیدای شێوەنی -گۆران-م

کەچی ڕۆڵەم، کەژاڵی جوان، وا کۆلیلی گەرمەشێنت

مەرگی (گوڵاڵە و عەنبەریش) دێنێتەوە بەرچاوانم

هەموو ئەبن بەنێشێك و ئەڕۆن هەتا سەر ئێسقانم

ئەی هۆنراوەی ماتەمینی ئەم دنیایە،

خەڵکە ئێوە لۆمەم مەکەن، کۆستەکەی من زۆر گرانە!

تەنها خاکی خەم و خوێنە وەکو دڵی من وێرانە)[11]

شاعیری نوێی کورد لە گەڕان و پشکنینا بەدوای سەرچاوەی ڕوون و بەفەڕدا بۆ دۆزینەوەی شێوەی نوێ و دەرخستنی دەنگی تایبەتی خۆی لە فەرهەنگی ئەفسانەکانی جیهان، ڕۆمانە گەورەکان، تاقیکردنەوەی شاعیرە گەورەکان سوود وەردەگرێ و قسە لەوێدا بۆ مەسەلەیەکی گەورەیە کە شاعیر ئەك لە دوورەوە هێمای بۆ دەکات بەڵکە لە نزیکەوە ئاگاداریەتی و ڕووداوەکانی ئەو مەسەلەیە کە زۆر شاعیرانە قفل بەشێوەی شیعرەکەی شاعیر دەدەن. وەك نموونە ڕۆمانی -ئینجە مەمەد- یاخود بڵێین -حەمەدۆك-ی یەشار کەمال واتا پاسایەکی تایبەتی -دەق گرتوو- وەك بەرنامەیەك ئەخراوەتە پێش چاوی هەتا پەیڕەوی بکات و ئەتوانێت لەو یاسایانە لابدات. بۆنموونە شاعیری کلاسیکی کورد بەپێی دابەشبوونی شێوەکانی شیعر دەبوا لەسەر یەکێك لەم شێوانە شیعرەکەی خۆی داڕێژێت: دوو تاکی -مەسنەوی-غەزەل، قەسیدە، یەك تاکی -فەرد، چوار خشتەکی، تەرجیع بەند و تەرکیب بەند، موسەممەت، موستەزاد، مولەممەع، موەشەح.

هەر لە بارەی کۆت و پێوەندی شێوەوە دەبوا شاعیری کلاسیکی کورد بۆ دەرخستنی شارەزایی و توانا و دەسەلاتی شاعیری و داهێنانی خۆی لە داڕشتنی شێوەکەدا پەیڕەوی هونەری جوانکارییەکان -الفنون الکلامیە- بکات کە بەلاغەتیشی پێ دەوترێت: وەك (استعارە، مەجاز، تعقید، تضمین، تلمیع، توریە...هتد.) بەڵام لە شێوەی نوێدا شاعیر لە دنیای خۆیدا هەر جارە شیعرێکی، جۆری داڕشتن و هونەرکاریەکەی دەبێتە یاسا لە دنیایەکی تایبەتیدا کە شاعیر پەیڕەوی ئەو یاسا بەربلاوە فراوان و بێ کۆت و پێوەندە ئەکات. ئەم مەسەلەی سەربەستی نواندنە لە داڕشتن و ئارەزوومەندی تایبەتی شاعیر خۆیەوە هەر دەبوا بهاتایە پێشەوە و پەیڕەوی یاسای گۆڕان و پێشکەوتن بکات کە هەموو شت دەگۆڕێ و دنیا لە بارێکدا ئامێنێتەوە و پێش دەکەوێت واتاو تەنانەت فەرهەنگی نوێی شیعریی دێتە پێشەوە ئەویش کە شاعیر لەو فەرهەنگەوە سوودمەند دەبێت و وەك هەوێنێك کە چەندەها جۆر شێوەی جیاوازی لێ پێکدێ ئەویش واتا و وشەکان دێنێ و فۆرمی شیعری خۆی لەسەر دادەمەزرێنێ، ئەگەرچی ئەو فەرهەنگەش دەبێتە تاقیکردنەوەیەك و لە ئەنجامدا سەقامگیر دەبێت بەڵام دروستبوون و هاتنە پێشەوەی شتێکی حەتمییە ئەوەندەی کە گۆڕان و پێشکەوتن یاسای سروشتە و حەتمییە و هەقیقەتە، هەر لەم بارەیەوە -گۆران-ی شاعیر نووسیویە (بوێژی تازە ئەوەندەی بوێژی کۆن لە هونەری یەکخستنی وشە و سفت چنینی وتەدا وەستا نییە بەتایبەتی بوێژەکانی

ئێستامان هێشتا لە دەوری تاقیکردنەوە تێنەپەڕیون لە سەرەمێکیشا ئەژین کە تەنانەت ئەو فەرهەنگەی وشەی لێ هەڵئەبژێرن بۆ بەرهەمیان هێشتا لە قاڵبا نەمەبیوە ئەم هۆیە دەستی زۆرە لەوەدا کە شتی تازە زوو ئەتوانێ شوێن پێ پتەو کا لە مەیدانی هونەرەکەی خۆیا بەلام لەبەرئەوەی هێزێکی تازەیە و ئەو شەقامەی گرتووە کە کاروانی مێژووی بەسەرا پێش ئەکەوێ لە ئەنجامدا گرەو هەر ئەو ئەیباتەوە(۱۳).) هەر لە بارەی هەمان مەسەلەی شێوە و دەربڕین و فەرهەنگەوە -گۆران- بەزمانێکی سادە و ئاسان بیروڕایەکی قووڵ دەربارەی شێوەی شیعر دەردەبڕێت و دەڵێت( ئەگەر پێویستی وەزن و قافیە لە کایەدا نەبوایە نیاز و مەبەستی دڵ زۆر بەئاسانتر وە ڕەوانتر ئەدرکا)(١٤). لەم بۆچوونەوە شێوەی نوێی شیعری کوردی بەجۆرێك دەگاتە هاناو فریای بەرزبوونەوەی ناوەڕۆك، کە وێنەی شیعری جوان، داب و نەریتی نەتەوەیی، فۆلکلۆر، تێکەڵ بەخواست و ئارەزووی خۆی دەکات، شاعیر -محەمەد ئەمین پێنجوێنی- لە شیعری -کۆتەڵی کامەران-دا، کۆچی کامەران، لەو پلەیەدا دائەنێت کە دەبێت بەپێی داب و نەریتی ڕەسەنی کورنەواری کۆتەڵی بۆ بکرێت، چونکە لە ناو -جاف-دا بەتایبەتی بۆ پیاوی گەورە، لە ماتەمیا کۆتەڵ دەکرا. شیعرەکە هەر لە سەرەتاوە -هارمۆنیەتی- مۆسیقایەکی ماتەمی تایبەتی تێدایە، ڕستەکان، واتا کێشەکانی سەراپای شیعرەکە کورت و ڕەوانن، لەم کێشە ئاسان و سووکانە شاعیر وێنەی جوانی دروست کردووە، کە دیارە- وێنەی شیعریی-ش یەکێکە لە خاسیەتە گرنگەکانی شێوە، جگە لەوەی کۆك و لە باریی و نزیکی قافیەکان زیاتر یارمەتی ئەوەیان داوە کە مۆسیقای شیعرەکە نەشاز و قوڕت و هەناسەتەنگی تێ نەکەوێت، لە یەکێ لە وێنەکانی -کۆتەڵی کامەران-دا دەڵێت:

«ئەمدی ژنان پرچیان ببڕن
پەلکەیان بکەن بە بازن
تا حەو ڕۆژە
پیاوان شانیان لە قوڕ نابێ
زین و کەلپۆزی سوارەیان
بە عورفی ناو خێڵاتی جاف
بەناوەژوو
لەبەر ڕۆژا
لەسەر پشتی ئەسپ نابێ»(۱۵)

له شێوەی نوێی شیعری کوردییا هەردوو بابەتی مەنەلۆژ و دیالۆژ جێگای تایبەتی خۆیان هەیە. شاعیری نوێی کورد لەو سەربەستییەدا کە شێوەی نوێ پێی بەخشیوە گفتوگۆ ساز دەکا کە ئاخاوتنی نێوان دوو کەس یاخود زیاترە.

لەمەدا زۆر شت کە شاعیر باش بۆی دەست ئەدات بەشێوە ئاسایییەکەی شیعر-مەبەستمان تەنها شیعری نوێیە دابڕێژێت ئەوا سەربەستانە بەلام بەورییاییەوە. ئەو چەند ڕێگایە دەگرێتە پێش لە ڕابوردوویەکی نزیکدا -کامەران-ی شاعیر چەند تاقیکردنەوەیەکی لە دیالۆگدا هەیە لێرەدا تەنها یەك نموونەی لێ دەنووسین ئەو دیالۆگەش لە نێوان دوو لایەندایە، لایەنێکیان تەنها شاعیر خۆیەتی و لایەنەکەی تریان دوژمنانی گەل و نیازەکانی شاعیرن:

(وتیان ئەو ڕێیە کە تۆی لەسەری
مانای ئەوەیە بەلاوی ئەمری
منیش پێم وتن ئەم ڕێیە ئەگرم
بەگەردن کەچی و کەساسی ئەمرم)

لەو دوو بەیتییەدا واتاکانی، -وتیان-پێم وتن- حاڵەتی ئەو دیالۆگەیە کە باسمان کرد، شێوەیەکی لەمە نوێتر کە دیالۆگە لە نێوان دوو دڵداردا کە قەمەر و ڕێکەوتێکی کورت و لەپڕ دروستی کردووە.

لە شێوەی داڕشتنی نوێدا خاوبوونەوە و کەرتبوونی دەنگەکان دەبیسترێت، ئەم دیاردەیە لە هەمان کاتدا لای گەلێ لە شاعیرانی عەرەب دەبینرێت، کە ئەوانیش بەتایبەتی لە کۆتایی شیعرەکانیانەوە وشەی قفڵی شیعرەکە لەت دەکەن و دەیگەڕێننەوە بۆ ئەو تیپانەی کە وشەکەی لێ پێکهاتووە -جەلال بەرزنجی- کە شاعیرێکی ئەم ڕۆژگارەمانە و شێواز -اسلوب-ی تایبەتی خۆی هەیە و زیاتر گرنگی دەدات بەمۆسیقای ناوەوەی شیعرەکانی، ئیقاعەکانی لە ناوەوە تەشکیل دەبن و دەردەکەون شاعیر لە یەکێ لە تاقیکردنەوەکانیدا، کە دیارە مۆرکی کاریگەری شێوەی لەتبوون و خاوبوونەوەی دەنگەکانی یەك وشەی تیایە دەڵێت:

«دەمخرۆشێنێ
بینینم لا دروست دەکا
بینینێك دەڕوا

وەك سەوزایی

دەشکەڕێتەوە

وەك مەرگ

دەم خرۆشێنێ

د

ە

م

خ

ر

ۆ

ش

ێ

ن

ێ»(١٩)

ئەمە جگە لەوەی هەوڵێکی وەك ئەم تاقیکردنەوەیەی شاعیر لە چەند شیعرێکی -نازم حیکمەت-دا دەبینرێت.

هەر لە شێوەی نوێی شیعری کوردیدا چوارین وەك یەکێك لە جۆرەکانی شیعر زیندوو دەبێتەوە و دێتە ناو کۆڕی شیعری کوردییەوە، جگە لە -کامەران موکری- کە ماوەیەك بە نووسینی چوارینەوە خەریك بووە لەم دواییانەدا چەند شاعیرێك بەڵام بە سەربەستی زیاترەوە چوارین دەنووسن وەك -ع.ح.ب- و -ئەحمەد تاقانە- و -غەریب پشدەری- کە دەڵێین چوارین مەبەستمان تەنها یاسا باو و گشتییەکەی نییە کە قافیەی یەکەم و دووەم و چوارەم وەك یەك بن و تەنها سێیەم جیاواز بێت، بەڵکو ئەم شاعیرانە چەند گۆڕانکارییەکیان لە قافیەکاندا کردووە، هەندێ جار بووە بەدوو بەیتی، یاخود قافیەی یەکەم و سێیەم وە قافیەی دووەم و چوارەم یەکێکن یاخود یەکەم و چوارەم یەکێك بووە و دووەم و، سێیەم یەکێك بوون، بۆ نموونە لە هەندێ چوارینی -غەریب پشدەری-دا نیوە دێری دووەم و چوارەم جووت قافیەن بەڵام یەکەم و سێیەم سەربەستن، ئەم سەربەستییە جۆرە مەودا و دەرفەتێکی هەناسە دەدەن بە شاعیر کە بتوانێت زیاتر مەبەست بهێنێ و قووڵتر بیر بکاتەوە:

(هەرچەندە هێمای عیشقێکی زەردی
دواپرۆژەکـانـی وەرزی تـەمـەنـم
لـەبـەردەم تـۆف و زریـانـی دزێو
وەك رەگ و ریشەی دارودەوەنـــــم)[٢٠]

هەروەها پۆستەری شیعریی کە ئەمیش بەشێك لە هەوڵەکانی شاعیری نوێ لە دروستکردنی شێوەی نوێدا دەچێتە بارێکی تەکنیکی وەهاوە کە شاعیر رووداوێك دەهێنێت و دەیکاتە نموونە بۆ مەسەلەیەکی لەو گەورەتر وە لە شێوەدا پۆستەر بەرەهێدان و پێشکەوتنێکی گەورە و بالآی چوارینە چونکە چوارین هەمان لێدان و کۆتایی دوایی تێدایە و زۆرجاریش باسێك یاخود گێرانەوەیەکی هونەری کارەساتێکە و هێمایە بۆ باس و مەسەلەیەکی لە خۆی گەورەتر، جگە لەوەی کە قەوارەی بابەتە نووسراوەکە لە هەردوو جۆردا نزیکن لە یەکەوە وە لە بواری زانستی ئیستاتیکادا شێوەی نوێ دەورێکی گەورەی هەیە بەجۆرێك کە شێوە دەبێتە یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی ئیستاتیکا چونکە (لەوە دەچێ زۆربەی خەڵکی لەسەر ئەو رایە یەك بگرنەوە کە یەکێ لە رەگەزە سەرەکی و پێکهێنەرەکانی جوانی -فۆرم-ە واتا شێوە، کە دەڵێن شێواز بانی یەکێتی و بەیەکەوە گونجان و تێکەڵییەکی پڕ لە هارمۆنیەت واتا -ئیقاع[٢١]، هەیە کە دەتوانین لەوێوە زیاتر بچینە دنیای ئەو شێوازە نوێیانەوە کە ئەمڕۆ شاعیری کورد پێوەی خەریکە و ئێستا زۆریان لە دەوری تاقیکردنەوەدان.


سەرچاوەکان:

١- مقدمة للشعر العربي -أدونيس-.

٢- في الجذور الاجتماعية لحركة الشعر الحر -نازك الملائكة- الآداب العراقية -ص٧.

٣- هونەری نازم حیکمەت -ئەکبەر بابایف.

٤- گۆڤاری ژین ی ئەستەمول-ژ١٤ ساڵی ١٩١٩ی زایینی.

٥- رەشید نەجیب و نوێکردنەوەی شیعر و نووسینی کوردی، تومەد ئاشنا -گۆڤاری بەیان- ژمارە-٢١ ساڵی ١٩٨٦.

٦- سەرچاوەی ژمارە دوو.

٧- تجربتي الشعرية- عبدالوهاب البياتي.

٨- حركات التجديد. س. مورية.

٩- بایەخی شێوە -خاتو مار جۆری بۆڵتن. کاروان -ژمارە ٥٧

١٠- کەژاڵی جوان -حەسیب قەرەداغی- کاروان ژمارە

١١- هەمان سەرچاوە

١٢- سەرنجێکی کورت لە شیعر، گۆران-

١٣- هەمان سەرچاوە

١٤- کۆتەڵی کامەران -کاروان- ژمارە ٥٨ ساڵی ١٩٨٧

١٥- گەرم نەبوونەوە -جەلال بەرزنجی

١٦- هەڵوێست -شیعری

١٧- سەرچاوەی ژمارە

# شیعر و کێشەی داهێنان

## بەشی یەکەم

هەموو لەگەڵ ئەو بڕوا بەخۆبوون و هەنگاونانەداین کە لە ئەنجامی هۆشیاری ڕۆشنبیری و شارەزاییەوە بەدی هاتبێ. ئەو نووسینانە خۆشەویست و کاریگەر نین دەیانەوێ ئامۆژگاری دابنەن ڕێگا و شوێنی دەستووری بۆ شاعیر دیاری بکەن، یاخود بیەوێ بڵێ ئەمەیە مەرجەکانی شیعر نووسین و بەم شێوەیە دەتوانی ببیە شاعیر!! ئەمە قسەیەکی پووچە! ڕاستە شاعیر ڕێنمایی دەکرێت بەڵام شیعر و بوون بەشاعیری سەرکەوتوو ئامێرێك نییە نموونەی بەرزی ئەدەبی و شیعری باش دروست بکات، بەڵکو لە سەرەتابیترین قۆناغی ئەم ئەرکە گەورەیەدا شیعر هەڵوێستێکە لەوەدا شاعیرەکە هەست دەکات کە خۆی بەشێکە لە ویژدانی نەتەوەکەی و لە ناو بۆتەی دژوارییەکانی کۆمەڵدا قاڵ دەبێت و پێ دەگات. خولیای جیهانە مەزنەکەی شیعریش ئەوەندەی سۆز و هەڵچوون و هەستی جوان پەرستییە ئەوەندەش پێویستی بەڕۆشنبیری پتەوە بۆ بەرەوپێش چوون و توانای داهێنان کە هەر لە چۆنیەتی داهێنان و گەورەیی و بچووکی ئەو داهێنانانەدا نەخشەی بوونی شاعیر و توانای قەڵەمەکەی دەکێشێ و لەلایەکی تریشەوە تێگەیشتنێکی زانستییانەیە لە باری واقیعی کۆمەڵ و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان. دراسەکردنی فەلسەفە و ڕێ و شوێنی پێشکەوتنی کۆمەڵە سەرەڕای ئەوەی کە توانا و دەسەڵاتێکی هونەرمەندانەیە بۆ بەکارهێنانی کەرەسەکانی شیعر و ئەدەب و مامەڵە پێکردنیان. شاعیری ڕاستەقینە نیمرۆ کۆن و کەلەبەری یاسا سروشتییەکان و گۆڕانە ماتریالییەکان دەپشکنێ و ئەوەندەی کە خۆی لە ژیانی وەردەگرێت دوو ئەوەندە بەژیان دەبەخشێتەوە. شاعیر تەنها بەهرەکەی خۆی و کۆمەڵێ دیوانی شیعری شاعیران دادی نادات و ناتوانێ لە سەردەمەکەی خۆیدا دەرکەوێ و نەمریی بۆ دواڕۆژی خۆی مسۆگەر بکات.

شاعیری گەورە مرۆڤێکی هونەرمەندە لە خامەکانی خۆیدا دەتوێتەوە و زاتێکی نوێ و جیاوازتر لەوەی دوێنێی لە خۆیدا دەخولقێنێ. من بە شتێکی خراپی نازانم پەنجە ڕاکێشم و بڵێم فلانە کەس بەڕاستی شاعیرە بەو مەرجەی بەتوانای داهێنان و باسی بەرهەمەکەی ئەم قەناعەتەی لای من دروست کردبێ. کە گوێم لە شیعرەکەی بوو ئەو

واتایەی -گۆران-م دێتەوە یاد کە دەڵێت: «هەموو جۆشی دڵم، هەموو نەشئەی کەللەم هەموو ڕووناکی ژیانم، هەموو تین و گەرمایی دڵداریم بەدوو ڕۆژ لە قاڵبی هەڵبەستێکدا داڕشتبووی»، شیعر ئەگەر ئەو ئازارە پڕ تام و خۆشە بێت خۆی بوون و ئەمریی خۆی دەسەلمێنێ. خۆی بەرەنگاری چەرخەکانی داهاتوو دەبێتەوە لە بەرانبەریا دەوەستێ.

هەموو دەزانین لەو سەردەمەی کە گۆڤاری گەلاوێژ بەردەوام دەردەچوو سەدەها شاعیر شیعری تیادا بڵاوکردەوە، دوایش گۆڤارەکانی ڕۆژی نوێ و شەفەق و هیوا و... هتد، ئینجا لەو هەموو شاعیرەی کە لە ژمارە نایەن دوایی چەندیان مانەوە و گڕەوی شاعیریەتیان بردەوە؟ بێ گومان چەند کەسێکیان کە بە پەنجەی دەست دەژمێرایێ وەك گۆران و پیرەمێرد و هەردی و دیلان و کامەران و دڵدار و ع.ح.ب و بەختیار زێوەر لەم سەردەمەشدا هەر بەهەمان شێوە دەنگێك دەمێنێتەوە کە شێوە و ڕێبازی تایبەتی خۆی هەبێ واتا دەنگی تایبەتیش بەلای منەوە بریتییە لە هونەرێکی ئیستاتیکی کە بنج بەستە بەکێشەیەکی فیکرییەوە بتوانێ لە ژیانی ڕۆژانەی کەسانی دەوروپشتا جۆرە گۆڕان و هەستکردنێکی زیاتر پێك بهێنێ، سەرسامی ببەخشێ، فەرهەنگێکی تایبەتی زمانی شیعریی ئەو کەسە بێت زۆرجار ڕێکەوتووە کە چەند شاعیرێك شیعرەکانیان لە پێناوی پەرەسەندنی کێشەیەکدا وتووە، هەریەکەشیان دەنگ و خاسیەتی تایبەتی شیعریی خۆی هەبووە هەر یەك لە دەرگایەکەوە چووەتە ئەو شارەوە. لەم ڕۆژگارەشدا کە سەرچاوەی باش و دەوڵەمەند زۆرە و کۆمەڵ پێشکەوتووترە زیاتر زەمینە لەبارە بۆ خولقاندنی ڕۆشنبیرییەکی شیعریی فراوان، ئەو کاتە سەردەمەکە خۆی پێوانەی هونەری و هەستی جەماوەر و سەنگی مەحەکە بۆ ئەوەی بزانێت کێ شاعیرە و کێ شاعیر نییە؟!

گرنگی مێژوو لەوەدایە هیچ کات بەسەر ئەو ڕووانەدا تێ ناپەڕێ و بەوردی لێکیان دەداتەوە. شاعیر کاتێك ئەمری بۆ دەنگی خۆی مسۆگەر دەکات کە هەڵچوونێکی کاتی و سۆزێکی تایبەتی لە قۆناغێکی کەم ئەفەس و کورتا شیعری پێ ئەڵێت بزانێ ئەوەی ئەیڵێ ئەبێ ئەمری سبەینێ بۆ خۆی مسۆگەر بکات. ئایا شاعیر هەست بەوە ناکات کە بەشێکە لە ویژدانی نەتەوەکەی. شیعری کاتی و باو و کەم تەمەن ڕەنگە چەند هۆیەکی ڕازی کردنی خەڵکی بەدەست بێنێ بۆ ماوەیەك دەریکەوێ بەڵام لە ئەنجامدا هۆشیاری کەسانیی ئەو کۆمەڵە و گۆڕانی باری ئابووری و قۆناغی نوێی مێژوویی پەردەی لەسەر لا دەبات چونکە ئەیتوانیوە دەوری پێشرەوی وریا کردنەوە ببینن، لە کاتێکدا پێویستە لەسەریان لە هەموو بارێکەوە لەسەر بیر و لێکدانەوەی خەڵکییەوە بن، واتا لەوان وریاتر

بێ بۆ نەخشەکێشانی قۆناغی گۆڕان و پێشکەوتن. لەلایەکی تریشەوە... هیچ خاوەن تیورێك و فەلسەفیەکی شۆڕشگێڕی دژ بەجوانی سروشت و ئافرەت و سێکس نییە. ئەمان لە کاتێکدا دژ بەو ڕوالّەتانە دەوەستنەوە کە هۆیەك بێت بۆ خۆ دەربازکردن لە هەقیقەتی تێکۆشان و بەرەوپێش چوون، زۆرجار دیمەنێکی نازداری سروشت یاخود کارەساتێك یا ڕوانینی جوانێك بۆ شاعیرێك بوو بەسەرچاوەی داهێنان و ڕەوتی پێشکەوتنی شیعر و ژیانی وە دەبێ بزانین شیعری نەمر ئاوازێکی دلّفڕێن و هێمنە، هەرچی گریان و پێکەنینی دنیا هەیە لە یەك ساتی تیژ تێپەڕدا دەری دەبڕێ و هەتا هەتایە لە گوێماندا دەنگ ئەداتەوە.

شیعر ئەگەر جێگەکەی تەنها ناو دوو بەرگی کتێب و ڕەفەی کتێبخانەکان بوو، ئەگەر شیعر نەکرا بەگۆرانی و سروودی دەم خەلّك، ئەگەر لە دایکبوون و مردن پێکەوە بوون، ئەگەر نەیگریاندین و یاخود ڕووناکی نەخستە دلّ و دەروونی تاریکمانەوە ئەوا هیچ پێویست نییە هەر ساتێك کاتی خۆمانی لەگەلّ بەفیڕۆ بدەین. هەردەم کە –عەنبەر خاتوونی، مەولەوی و دەوریش عەبدوللاّ و زیندانی ئەژدەهاکی گۆران دەخوێنینەوە دەلّێی یەکەمجارە ئەو شیعرەمان خوێندبێتەوە! ئاخۆ ئەم شیعرانە چ سیحرێکیان تێدایە وەها نەمرن؟! لە وەلامدا دەلّێین ئەوەندە بەسن کە شیعری جوانن و ئەو شیعرانەن کە گۆران– دەلّێت:

«شیعرێ گیانی تیابێ بژی و ببزوێ
زمانی دلّ بزانێ و باش پێی بدوێ»

مەبەستمان لە بوونی شیعر بەموڵکی جەماوەر ئەوە نییە شیعر هەموو کەس ڕازی بکات، کەس تووڕە نەکات و لە پێناوی هیچ بەرەیەدا نەبێ و دژی بەرژەوەندییەکانی بەرەیەکی تر نەبێت، ئەگەر وەها بوایە لە مێژووی ئەدەبدا، هەر لە دروستبوونیەوە هەتا ئەمڕۆ هیچ شاکارێك دروست نەدەبوو، شیعرەکانیش لەگەلّ بەسەرچوونی ئەو سەردەمەی تیا دروست بووە بەسەردەچوو.

ئێمە مەبەستمان لەم شیکردنەوەی باری داهێنانە ئەوەیە کە ئەدەبێکی باش و نەمر زیاتر بێتە ناوەوە و بەرە بسێنێ. ئەمەش ئەوە ناگەیێنێ کە ئێستا نموونەی باشی ئەو ئەدەبەمان نییە. بەلّێ هەمانە و ئەگەر بێتو هەندێکیان بگۆڕینە سەر زمانە زیندووەکانی جیهان دەتوانن بەو پێیەی تەعبیرێکی ڕاستەقینە و شاهێدی واقیعی نەتەوەکەیان بن

سەر بە تەکنیکی نوێی شیعر نووسین بەئاسانی دەچنە ڕیزی بەرهەمە سەرکەوتووەکانی ئەو سەردەمەی گەلانی جیهانەوە ئەمەش دیارە با وەهامان لێ نەکات کە چاومان لە داهێنانی گەورەتر نەبێت و لەسەر بەرهەمی دوێنێمان بژین، لە کاتێکدا پێویستە چاو لە سبەینێ و دواڕۆژێکی گەشتر بین. ئەنجا سەراپای ئەم کاری داهێنان و گەیشتن بەجەماوەرە دەبێ لەسەر بنچینە و یاسایەکی ئایدۆلۆژی سەر بەهەڵوێستێکی ڕوون و ئاشکرا بێت. کە دەوترێ ئەدەبەکەمان ئەدەبێکی واقیعی و سەر بەجەماوەرە نابێ لەوەش بێ ئاگا بین کە ئەو سۆزی بەجەماوەر گەیشتنە لە هەندێ مەسەلەی زانستی ئەدەب و ڕێگا فەلسەفییەکەی دوورمان بخاتەوە و تووشی غەفڵەت و هێرشی عاتیفەیەکی ڕووتمان بکات لەلایەکی تریشەوە بۆمان هەیە کە بڵێین شیعر و ئەدەبیات لەگەڵ زانستا دژ بەیەك نین و بگرە لە هەندێ جێگادا بەیەك دەگەنەوە بەڵام ئەگەر لە هەندێ لایەنەوە ئەدەب ڕێگای تایبەتی خۆی هەبێ تەفسیری جیهان و دیاردەکانی کۆمەڵ مانای ئەوە نییە شیعر و ئەدەب شتێکی نازانستی نامەنتیقییە. زانست دەتوانێ پێناسەیەکی دەریا بکات و دەرگاکە دابخات، بەڵام دەریا لە ناو هەر شیعرێکدا دەریایەکی جیاوازە! زانست دەتوانێ دووچاوی جوان پێناسە بکات و لە ژێر میکرۆسکۆپ و کەرەستەکانی زانستا بەچەند ڕستەیەك تەواوی پێناسەی ئەو چاوانە بکات بەڵام بەژمارەی هەموو چاوە جوانەکانی دنیا شیعری بەرز و گەورە خولقاوی پرشنگەکانی چاوی جوان بووە زانست دەفتەرێك بەکار دەهێنێت بۆ پێناسەی فرمێسك و شیعریش دەفتەرێکی جیاوازتر.

## بەشی دووەم

هونەرەکانی داهێنان هەمیشە دەرگاکانیان کراوەیە لە داخستن و قفڵ و ژەنگ بەدوورە و لە پێشوازی هەوای خاوێن و بۆنی خۆش و جووڵان و بزواندنێکی بەردەوامدایە، کەچی هەندێ قەڵەم دەبنە هێزێکی نالەبار و کلیلی ئەم دەرگایانە دەدەن و ژمارە لەسەر دەرگاکان دادەنێن لێرەدا مەبەستم لە فراوانی و بەپێزی خەیاڵە. ئەو خەیاڵەی دیوی دووەمی واقیعێکی سەربەخۆیە بۆ هێنانەدی و وەرەخساندنی باشتر و باشتر، هەندێ خەیاڵیش هەیە جگە لەوەی لە چوار دیواری تەسك ناچێتە دەرەوە ناتوانێ یەکێك لە دەرگا داخراوەکان بکاتەوە لە سنووری دنیایەکدا کە بشێ بۆ گەورەیی خەیاڵی مرۆڤ پەرە بەژیانی خۆی بدا. خەیاڵی واش هەیە کۆت و پێوەند و خەت و خشتە دانان نازانێت. لە هونەری داهێناندا کات و شوێن سنووری نییە باڵدارێکە باڵێکی هەمیشە هێزێکی

ئەمرەمەن ئاسا بەردی بۆ دەهاوێ و مەقەستی بەدەستەوە گرتووە. باڵی دووەمیش هێزێکی سیحراوی نەغمەیەکی مرۆڤانەیە پڕە لە حەسرەت و ئاوات و ئازار وەك چرایەکی دوور مژدەی گەیشتنی کاروان دەهێنێ.

لە هونەری داهێناندا هەر دەرگایەی سەرەتای ڕێڕەوێکە بۆ جیهانێکی تایبەتی، هەندێك بەهۆی تێن گەیشتن لە دیوە ڕاستەکەی دەیانەوێت دەرگاکانی کەی قفڵ بدەن هونەر تەنها خاوەنی یەك دەرگا بێت. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بپرسین، بۆ هەموو ڕەنگەکان یەك ڕەنگ نەبوون؟ لە شیعردا هەزار پرسیار بەرەو ڕووی گەردوون و بوون و نەبوون دەبێتەوە، لە چیرۆکدا کام ڕووداو باس دەکرێ بۆ چ کەسێکی خاوەن کۆمەڵێ سیفاتی تایبەتی دەکرێت بەپاڵەوان و بۆ چ واز لە دوو کەسی تر دەهێنرێ و هونەرمەند ئاوڕیان لێ ناداتەوە. هەندێك خوازیاری جۆرە شیعر و ئەدەبێکن کە پڕ بەپڕی مەبەستی خۆیان بێت و نەچێتە سەر ڕێگایەك کە مل بەرەو جیهانێکی جیاوازتر بنێت. دەڵێن شیعر لە قۆناغ و دەسەلات و ئیلتزام و بێ هەڵگرتنی مەندێ ڕێ و شوێنی ڕامیارییەوە دێتە دی گوێ نادەنە هەست و ئەستی و ساتە گەرمەکانی شیعر و ئەدەب شیعر بە پێویستییەك نازانن کە دوو دەنگی تیا بێت، دەنگێك کە بەدەنگ هاتنەوەی بانگەوازی ناخی کەسێك بێت.

دەنگێکیش کە پرسیار بێت و گومان لە هەموو دیاردەکانی سروشتا ئەهێڵێتەوە و ڕوونی بکاتەوە پاڵ پێوەنەرە ڕاستییەکانی یەك دەگرێ و گیان و کەرتبوونی زاتی مرۆڤ لە کوێوە بن و بۆ چ دێن؟ دەبێ بزانین لە پەیوەندییە هونەرییەکاندا نەخشەیەکی ئەوتۆ نییە کە خۆی لە خۆیدا ناوی هونەری فلانە مەسەلە بێت و بەپێی فلانە یاسا و لەو مەسەلەیە بدوێت بیخاتە پێش چاو. مرۆڤ بەهەناسە و خواردن و بزواندن دەژی، کەواتە بۆ ئیلتزام کردن بەژیانەوە پێویست پاساکانی هەناسە و خواردن و بزواندن بەجێ بگەیێنرێت، هونەریش هەروەها، بەلام جیاوازییەکە لەوەدایە کە هونەر گەورترە لە کۆمەڵێ کار و بزواندنی میکانیکی بۆ بەردەوامی ژیان. کەسێکی بێ هیچ هەست و دەروونێکی هونەری مولتەزیمە بەیاسا میکانیکییەکانی ژیانی خۆیەوە، وە نەبێ هونەرمەندیش لەو یاسایانەدا بەدەر بێت بەلام ئەم هەمیشە بەدوای هەوای نوێ و بۆنی خۆش و هەناسەی قووڵترا دەگەڕێت و ئەمە بەلاوە مەبەستە، بۆیە هونەری داهێنان دژی یەك دەرگایی و یەك ڕێگەیی و جۆری ژیانە.

# بەشی سێیەم

لە پەیوەندی توندی مرۆڤ و سروشتەوە هەموو دیاردەکان – ئەو دیاردانەی بەردەوامی ژیانی مرۆڤن، سەرهەڵدەدەن و گەشە دەکەن بۆیە لە لێکۆڵینەوەی خاسیەتی جۆرە تایبەتییەکانی هەر نەتەوەیەکدا دەبێ بەوەدا تێبهەڕین کە بنەمای ئەو خاسیەتانە دەگەڕێتەوە بۆ جۆری ژیان و بەرفراوانی هەموو تاقیکردنەوەکانی ژیانی مرۆڤ. لە مێژوودا بەگشتی و لە ئەدەبی نەتەوەکانی جیهاندا بەتایبەتی ئەوە دیار و ئاشکرایە کە هەریەك لە شاکارەکان و ئەفسانە و داستانەکان مۆرك و تاقیکردنەوەی سەرلەبەری خۆی لە ڕەگەزی نەتەوەیی و دیاردەکانییەوە وەرگرتووە. بەمەدا دەزانین کە خوێنی شاسەماری مێژوو هەوڵی بێ پشووی مرۆڤە بۆ بەربەرەکانی ناتەباییەکانی سروشت و خستنە ژێر دەسەڵاتی ئەمری خۆیەوە. لەو ڕۆژەوە کە مرۆڤ بۆتە خاوەن نیشتەجێ بووی وڵاتی خۆی و سڵی لەوە نەکردۆتەوە کە ئاوەدان و جوانی بکات وە هەموو خۆشەویستی خۆی پێ ببەخشێت. جگە لەوەی کە ئامادە بووە ژیانی خۆی بۆ بەخت بکات. ئینجا لەم پەیوەندییە گەورەیەوە دەتوانرێ تیشك بخرێتە سەر گشت کارە مەزنەکانی مرۆڤ لە داستانەکانی پاڵەوانێتی خستنە ناو قاڵب و چوارچێوەی هونەرییەوە و ئەدەب و مێژووی ئەدەبی لێ پەیدا بووە نابێت خواست و مەبەستە تاکە کەسییەکانی مرۆڤە هونەرمەندەکانیش بخرێتە لاوە کە لایەنی زاتی پەرە پێدراوی ئەو سامانە گەورەیە پێکدەهێنن. خوێنەری باش و وریا هەمیشە لە خوێندنەوەیدا هەست بەوە دەکات کە ئەو دیاردە نەتەوەییانە بڕبڕەی پشت و پاڵپشتی تەواوی ئەو ئەدەبە بوون. چونکە ئەوە ئاشکرایە کە نەبوونی مۆرکی نەتەوەیی و دەرنەکەوتنی ئەو دیاردانە لە ئەدەبدا جگە لەوەی ئەمری خۆی لێ دەسێنێتەوە ئەوا وەك منداڵێکی بێ ناونیشان و بێ دایك و باوکی لێ دێ کە ئەمیشی ون کرد ئەوا مۆرکی جیهانی خۆشی لێ زەوت دەکات و ئاکامێکی خراپی بۆ بەجێ دەهێڵێ. لێرەدا دەپرسین ئایا ئەو دیاردە نەتەوەییانە چین؟

وە تاوەکو چەند پەیوەندیدارن بەزیندوویەتی ئەدەبەوە؟، هۆی یەکەم یاخود دیاردەی یەکەم بەلای مێژوونووسانی ئەدەبەوە زمانی دەربڕینە. زمانی توندوتۆڵی بەهێز و شارەزابوون لە ڕەسەنایەتی و نەجوینەوە و دووبارە نەکردنەوە نرخی تەواو نابێت. بۆ نموونە بڕوانە دوو چیرۆکی فۆلکلۆری کە بەیت بێژێك و کەسێکی ئاسایی بێ بەهرە

بیخەنە ڕوو. شێوەی زمان هەر هەمان شێوەیە و بەسەرهات هەر هەمان بەسەرهاتە و کەچی دوو تام و بۆ و دوو کاریگەری جیاوازی هەیە. وەك ئەو چیرۆکەی کاتێ کابرایەك هاتبووە دێیەکەی- حەمزاتۆفەوە گێڕابوویەوە. هەموو خەڵکی ئاوایی بەسەرهاتەکەیان بیستبوو کەچی دەتوت نەیان بیستووە یەکەمجارە گوێی بۆ هەڵئەخەن. ئەمە تەنها لەبەرئەوەی کابرا زمانی گێڕانەوەی هونەریبانە و بەبڕشت بوو. بۆیە لە خوێندنەوەی ئەو جۆرە چیرۆك و شیعر و داستانەدا کە بەزمانی زگماکی خۆ بێت و وەرگێراو نەبێت هەست بەدیاردەیەکی جیاواز و کەش و سروشتێکی تایبەت دەکەین.

دووەم دیاردە بەلای منەوە لەو ئەدەبە نەتەوەییەدا کە دەنگی مرۆڤانەی خۆی پێ بگەیێنێتە نەتەوەکانی دوور و نزیك سروشتی هەڵکەوتوو خۆیەتی سەبارەت بەئاو و هەواو کەش و وەرز و زەوییەکەی. لە ناوچە شاخاوییەکاندا هەڵدێر و دارو بەردی سەخت و بەفر و مەترسی دڕندە و ئاژاڵداری و گیانلەبەری و باڵداری هەمە ڕەنگ دیاردەی بەرچاون لە بیابان و دەشتە بەرینەکاندا تینی نەبڕاوی گەرما یاخود ڕووباری درێژ و کێڵگەی فراوان و فەرشی سروشتی ڕەنگین.

لە ئەدەبی فەلەستینییەکاندا تامی زەیتوون و پرتەقاڵ، لە دێهاتی بنار و قەد چیاکاندا چیرۆکی گوێ ئاگردان و شاڵ و بەرگی زبر و مرۆڤی گورج و تیژڕەو ئەو دیاردانە بەکاری وەرگێڕانی دەقی ئەدەبی لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەبنە شاهێد بۆ ڕاستەقینەی سروشتی ژیان و گوزەرانی خەڵکی و لەخۆ دەرخستنیاندا لە کارە هونەرییەکەدا ئەمری پێ دەبەخشن.

لقی سێیەمیش بۆ دەرخستنی دیاردە نەتەوەییەکە ڕۆڵی مێژوویی نەتەوەکە خۆیەتی، چونکە ئەمڕۆمان لە ئەنجامی گۆڕانە لە مێژوویەکانی دوێنێوە بەدیهاتووە. مێژووی هەر نەتەوەیەکیش جگە لەوەی سەرجەمی تاقیکردنەوەی ژیانیەتی لە کات و سەردەمی جۆربەجۆردا ئەویشی تێدایە کە مێژووی هونەر و ئەدەب و کەسانی خاوەن بەهرەی شارەزای سەربەخۆیەتی. خۆ ئەگەر ئێمە لە مێژوودا جۆرە شارەزاییەك بەکاری هونەر و کاری بەسەرهاتی دوێنێ و ئەمڕۆ موتوربە بکەین ئەوا لە ئەدەبەکەماندا دوو هێزی ئەمرمان کۆکردەوە و کردمانە دڵ و ژیانی نەتەوەییمان. لقی چوارەم لایەنی سایکۆلۆژییە، چونکە هەر خوێنەرێك لە هەر جێگایەکی ئەم زەوییەدا -ئەحمەد-ی پاڵەوانی چیای ئاگری یەشار کەمال و - حەمە عەلی کورد-ی پاڵەوانی چیرۆکی -تەنەکە-ی هەمان نووسەر بخوێنێتەوە ئەوا لە سایکۆلۆژییەتی کەسێکی چیا نشین

ئەگات و ئەو سروشتەشی دێتە بەرچاو کە ئەو چیابییەی لە باوەشدا پەروەردە بووە.

پێنجەم شتێك لەم باسەدا کە ئاوڕدانەوەیەکی هۆشمەندانەیە لە نەریت و خووڕەوشتی کەسانی نێو ئەو نەتەوەیە، وە قووڵ بوونەوەیە بەرەچەڵەکی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەدا، چونکە خاسیەتی ئەو ئێسکەی کە کۆمەڵی لەسەر دروست دەبێت ئەوەی کە کۆمەڵێ هەڵسوکەوت و نەریت و خووڕەوشت پێکی دەهێنن. دەشێ دوو نەتەوە لە نەریتێکدا یەك بن بەڵام لەسەر پاکی ئەوانی تردا ناچنەوە یەك جێگا و هونەر بەکاری لێهات و چالاکی خۆی دەزانێت چۆن نەریتە کۆن و بۆگەن و بێ کەڵکەکان بەلاوە دەنێت وە بە چ شێوەیەکیش بە بەرهەمەکەی ڕەچەڵەك و بنەمای ئەو عورف و نەریتانە تۆکمە و ڕەنگین دەکات و بەشداری دەکات لە ناساندنی کۆمەڵی خۆی بەکۆمەڵ و نەتەوەکانی جیهان. سەرچاوەی ئەم لقەش لە ئەدەبەکەماندا چەندەها بەیت و شێوەی ئەدەبی فۆلکلۆرییە زۆربەی داب و نەریتی کۆمەڵی کوردەواری تیادا ڕەنگ دەداتەوە وەك شایی و شین و سواری و تفەنگچێتی و ڕاو و شکار و میوانداری گەرمیان و کوێستان و مەقام و لاوك و حەیران و لاواندنەوە و...هتد.

لقی شەشەم پێشکەوتنی شارستانی ئەو گەلەیە کە لە ئەدەبەکەدا خۆیان دەنوێنن. ئایا شیعرەکە چەند توانای بەسەر دەربڕینی هەستی نەتەوەیی خۆیدا هەیە بەبێ ئەوەی بهێڵێ ببێتە کارێکی توخم پەرستی و خۆ بەباشتر زانین.

مەبەست لەم کورتە باسە تەنها ئەوە بووە کە ئایا ئەو دیاردە نەتەوەییانە چەندە لە خزمەتی بەرزکردنەوەی ئەدەبی هەر نەتەوەیەکدایە و چەندە لە گەیاندنی ئەو ئەدەبەدا بەجیهان لە کار و برەودان. دەستنیشان کردنی نموونە لەم ڕووەوە زۆرە. هەر لە ئەدەبی گریك و یۆنانی کۆن و چەرخەکانی ناوەڕاست و ئەم چەرخانەشدا کە زانست کارامەیی کاری زانستن و جیهانی وەك تاڵ و ڕێشاڵی تۆڕێك گەیاندووییەتییە یەك هیچ ئەدەبێکی زیندووش خاوەنی خۆی بزر نەکردووە و چێژی تایبەتییان پێ بەخشیوە. بۆ ئاگاداربوون لە مەبەستی ئەم جۆرە باسانە دەشێ بەئاگا هێنانەوەیەك بێ ئەمەش ئەرکی هەر نووسینێکە لە بواری مێژوویی خۆیدا کە خۆی بە بەرپرسیار بزانێت.

# گەرمبوونەوەی گیانێکی تەزیو

ئەم نووسینە بریتییە لە ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی شیعری -سەلاح محەمەد-ی شاعیر کە لە ژمارەکانی -٥٤، ٦٥، ٧٢ی ڕۆژنامەی عیراق بڵاوکرابوونەوە.

## بەشی یەکەم

لە کاتێکدا دەچینە ناو جیهانی تایبەتی هەر شاعیرێکەوە، ئەویش بەسرنجدانی ورد لە شیعرەکانی، گەلێك پرسیار و بیروڕاو هەست و دەرك پێکردنی جۆراوجۆرمان لا دروست دەبێت شیعرەکان خۆیان کەم و زۆر دەرگای ئەم ئارەزووانەمان بۆ دەکەنەوە و شیعر یاخود کەسان و شتەکانی ناو دنیا شیعرەکەی دەکەونە گفتۆگۆ لە گەڵماندا و هەندێ جاریش کێشە و جیاوازی لە نێوانماندا بەرپا دەبێت و لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا دوایی دەگەینە زۆر ئەنجام ئەگەریش هەمووی نەبێت. بەتایبەتی کاتێك کە نووسەرێك بەچاوی ڕەخنە و لێکۆڵینەوە لە شیعرەکان دەڕوانێت دەکەونە هەڵسەنگاندنیان. ئەوا لە سەرەتای چەند ڕێگایەکدا خۆی دەبینێتەوە و دەبێتە کەرستە هونەری و فیکرییەکانی ڕێبوارێکی شارەزا و ڕێ نیشاندەر لەو ڕێگایانەدا، بۆ کەسێکی وەکو منیش کە لە یەکەم شیعری شاعیرەوە هاوڕێی سەفەر و ئیستگە و شارەزای قەڵەمی شاعیرانە و جیهانەکەیم، ڕەنگە کارە ڕەخنەیی و هەڵسەنگاندنەکە باشتر ئەنجام بێکێ و لە هەمووان پتر لە ناخی شاعیرانە و هەست و ئەست و هەڵچوون ئارامییەکانیدا بچمە خوارەوە و باشتر بیانبینم. ئەم گەشتەی من ئەگەرچی تەنها بەجیهانی سێ شیعردایە بەڵام شار و شارۆچکەکانی جیهانی شاعیر ئەوەندە لە یەکترەوە دوورنین کە هەوا و کەش و تام و بۆی ئەو شیعرانەی تریشی لێوە هەست ئەکەین بۆیە لە یەکەم هەنگاوەوە دەتوانین زۆر بەئاسانی دەرك بەوە بکەین کە سەلاح محەمەد -شاعیرێکی- لیریکی غنائییە، ئەمە وەك خاسێتی گشتی شیعرەکانی، نەك وەکو هەندێك هەڵوێست وێنە و کارەساتی درامی بچووك بچووك لەملا و لەولاوە خۆیان دەنوێنن و زۆرجاریش پەل دەهاوێن بۆ مەسەلە گەورە و پیرۆزەکان، ئەمە جگە لەوەی کە وێنەی شیعری بۆتە یەکێك لە هەرە ڕەنگە تۆخ و گەشەکانی تابلۆی شیعرەکانی ئێمە وتمان، شاعیرێکی- لیریکی غنائییە، سەبارەت بەم بڕیارە ئایا چیمان بەدەستەوەیە هەتا ڕاستی بیروراکانمانی پێ بسەلمێنین؟ جگە لە سیفەتە تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە شیعرە و بەراورد کردنی لەگەڵ شیعرەکانی شاعیردا. لەم

ڕووەوە گەلێ بیروڕا هەن کە شیعری لیریکی بەشیعری ڕۆمانسی دادەنێن و هەمان حیسابی لەگەڵ نەکەن بەلام لە ڕاستیدا حاڵەت و خاسیتەکانی شیعری و ڕۆمانتیکی یەکێکە لە ستوونەکانی شیعری لیریکی کەواتە بابزانین چۆن ئەم شیعرانە دەناسینەوە و پەنجەی لەسەر دادەنێین، شیعری لیریکی غنائی:

(١) ئەو جۆرە شیعرانەن کە مەودای هەناسەیان کورتە لەسەریەك ئیقاع داڕێژرێ و پشووی شاعیرکەم ماوەیە و زۆریان پارچە شیعر یاخود شیعری کورتن.

(٢) تایبەتمەندی خودی شاعیر زاڵە هەندێ دەڵێن عاتیفی یا زاتی.

(٣) لایەنی درامی تیایدا کزو لاوازە و یاخود هەر نییە.

(٤) لەبەرئەوەی دراما وەك لە خاڵی سێیەمدا وتمان کزە شیعرەکە تەنها هەڵوێست و ڕامان و ڕوانینی یەك لایەنەی شاعیرە بەرانبەر ڕواڵەتەکان و خودی ڕواڵەتەکان.

(٥) شیعرەکان بێ گرێ و گۆڵ سادە و ڕەوان خۆیان دەنوێنن ئینجا وەك کارێکی پراکتیکی کاتێ تەماشای هەندێ نموونە لە شیعرەکانی شاعیر دەکەین ئەم ڕاستییانەش بەدیاردەکەون:

ئەم شەو لام بە مەڕۆزەوە
بەفر کۆلانی گرتووە
هەرچی هەورە هێناویەتی
کۆچ و باری خۆی خستووە
چراکەی منیش لە جاران
بەکوڵتر جۆشی سەندووە
ئەوەی ماوە لە ئامێزە
دەنا چی تر لە کۆلانە
بەبێ دەنگی، خۆی مردووە![(١)]

شیعری لیریکی مێژوویەکی دێرینی هەیە تەنانەت زۆر لە پێش شیعری درامی و مەلحەمیدا مرۆڤ خۆی پێوە خەریك کردووە، وەك چۆن مرۆڤ بۆ بەردەوامی ژیانی و دابینکردنی پێویستییەکانی لەش و گوزارەیی خۆی پێویستی بەخواردن و خواردنەوە جنس و خانوو کشتوکاڵ و پەروەردەکردنی گیانلەبەران و منداڵ بوون زۆر شتی تر بووە بەرانبەر بەمەش ویستوویەتی پێداویستییە ڕوحییەکانی خۆی تێر بکات و دابینی بکات،

شیعر و مۆسیقاش له یەکەم ڕۆژ و له سادەترین شێوەدا هاوڕازی ئەم داخوازی حەزە ڕوحیانەی مرۆڤ بوون. ئەو شیعرە لیریکییانەی کە لەگەڵ ئامێزەکانی مۆسیقادا خوێندراونەتەوە وتراون ئاڵۆزی دەروونی ماندووێتی لەشی و جەنجاڵی مێشکی حەساندووەتەوە، هەر لەو کاتەشەوە مرۆڤ ئەم شیعرانەی لەسەر نەزم و ئیقاعێکی تایبەتی وتووە، ئەگەرچی نەیانزانیوە ئیقاع چییە؟

نووسین و خوێندنەوەش نەبووە، بەڵام لە شێوەی ڕێکخستن و دەنگی وشە و دەستەواژە و ڕستە کورتەکاندا ئەم ئیقاعە بەشێوەیەکی سروشتی پێکهاتووە لەم بارەیەوە دکتۆر کەمال عید لە کتێبەکەیدا (فلسفة الادب والفن) نووسیویە:

(هەروەك چۆن ئیقاع لە سەمادا بەجۆری جووڵانەوەی هونەرمەندەکەوە بەستراوە لە شیعریشدا بەدەنگی وشەکانەوە بەستراوە)[٢] لێرەدا پێویستە ئەوەش بزانین کە ئیقاع و شێوەی دابەشبوونی هارمۆنی شیعری لیریکدا زۆر ئاشکراتر و بەهێزترە لە ئیقاع و هارمۆنییەتی شیعری درامی و مەلحەمی چونکە خودی شیعری لیریکی چۆنییەتی دروستبوون و هەڵکەوتنی وەهای پێویستە کە تەرزێکی وەهای هەبێت، ئەوەش ئاشکرایە کە هەتا شیعر کورت بێ و ڕستەکان بچووك و وشەکان دەنگی تایبەتیان هەبێت ئەوا شاعیر زیاتر دەتوانێت گیانی ئەو ئیقاع و هارمۆنییەتە بەرزبکاتەوە، لە سەردەمێکدا زۆربەی هەرە زۆری شیعری لیریکی بۆ مەبەستی دڵداری و جوانی ئافرەت دەوترا. لە هەندێ شێوەی شیعری ڕۆمانسی نزیك بوویووەوە. هەروەك چۆن ئێستا لای ئەم شاعیرەمان واتە -سەلاح محەمەد- دەبینین کە شیعرە لیریکەکانی دوو دەنگە، دەنگێکی خۆی و دەنگێکی جیهانی عاتیفی و کارەساتە خۆش و ناخۆشەکانی ئەو چیرۆکانەی کە عەشقێکی پاك و ڕۆحی دروستی کردوون ئافرەت خاوەنی هەموو شتێکە تیایدا، ئینجا ئەم دوو دەنگە تێکەڵ دەبن و دەبنە ئەو شیعرانەی کە لەم باسەدا بەردەوام نموونەیان لێ دەبینین-هیگلی فەیلەسووف- دەڵێت:

(شیعری عاتیفی وەك مۆسیقا حاڵەتی ناوەوەی ڕۆح دەردەبڕێ) شاعیر خاوەنی پڕۆسێسی تایبەتی خۆیەتی و لەو جیهانە عاتیفەدا کە زیاتر کەسەر و حەسرەت و کۆمەڵێ بیرەوەری تاڵ ماوەتەوە، گەلێ لەو شیعرانەش کە باکراوندی خۆیان هەیە تەعبیرن لەو کارەساتانە دیارە بەهەر جۆرێك بێت ئەمە ڕوویەکی گەشی جیهانی شیعری هەر شاعیرێکە کە پێی دەگوترێت ڕاستگۆیی بەپێزە ئەم شاعیرە وەك دەستکرد بۆ ڕازی بوونمان و فووکردنە خۆی نەهاتووە کۆمەڵێ قەسیدەی درێژ و درامی و کارەساتی

مەلحەمی بهۆنێتەوە بەڵام لە ناخی خۆیدا هەست بە نەبوونی ڕاستگۆیی بکات ئەو کات هەرچی هاواریشی بکردایە کارە، شیعرییەکان لەبەر لە دەستدانی ڕاستگۆیی گرەوی خۆیان نەدەبردەوە.

## بەشی دووەم

لە بەشی یەکەمدا باسی لیریکی-مان کرد، هەر لەو شیعرانەدا هەست بەوە دەکەین کە شیعرەکانی سەلاح محەمەد بەڕاشکاوی مۆرکی ساتەکانی هەڵچوونی دەروون و هەژانێکی گەرمی پێوەیە، ئەمە خۆی خاسێتێکی باش و نیشانەی ڕاستگۆیی هەوێنی ئەو جۆرە شیعرانەن. بەڵام بەداخەوە هەندێ جار ئەم هەژان و هەڵچوونە بەجۆرێك بووە کە ماوەی نارامبوونەوە و مۆنتاج و پێداچوونەوەی شیعرەکانی لێ بەربەست کردووە. بۆ نموونە لە شیعری واگۆن شەودا شاعیر یەکێك لە هەرە سیفاتە گرنگەکانی شیعری نوێی لە دەست داوە ئەویش یەکێتی بابەتە- واتا (وحدة الموضوع) ئەم شیعرە وا ڕێکەوتووە لە ڕۆژنامەکەدا بەدروستبوونی بەرانبەر یەك بڵاوبۆتەوە، کاتێ تەماشای ستوونی یەکەم دەکەین و دەیخوێنینەوە هیچ شتێك پاڵمان پێوە نانێت کە وەها بزانین هەست بکەین شیعرەکە لە ستوونی دووەمدا تەواو دەبێت بەڵکو بۆ خۆی شیعرێکە و ناونیشانی خۆی بۆ دابنێین. تەنانەت جیهانی هەردوو ستوونە شیعرییەکە جیاوازن و بۆ خۆیان سەربەخۆن، لە بەشی یەکەمدا یاخود بڵێین لە سەرەتا یاخود ناوەندی شیعرەکە پرسیارێك سەرسامییەك شتێك نییە کە لە دوایی شیعرەکەدا وەڵام درابێتەوە بەمەش تەواوی شیعرەکە وەك ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ پێکەوە بەسترابن یەك خوێن بەهەموو دەمارەکاندا بگەڕێت، بالێرەدا تەماشای هەردوو پارچە شیعرەکە بکەین:

دڵێکی شکاو هارەی دێ
ئەو منالێکی چەتوونە
بەکۆڵاندا ڕەت دەبێ
چاوەکانی
دوو دۆزەخی پان و بەرین و بێ بنە
بایەکی سارد
دڵم پەرە پەرە ئەکا
پوورشی پەنجەکانم ئەبا

ئەمە ستوونی یەکەم، ئینجا با تەماشای ستوونی دووەم بکەین و بەراوردی بکەین لەگەڵ یەکەمدا بزانین هیچ پەیوەندییەکیان لە نێواندا هەیە؟

با ئیتر باران نەوەستێ
باران لە دڵی کەس نادا
ئیتر چۆن خۆشەویستی سەوز نەبێ؟!

لەم شیعرەدا کە ئێمە بەدوو بەشی جیاوازمان دانا، لە بەشی یەکەمدا دڵی شکاوی شاعیر دەچێتە وێنەی منداڵێکەوە رەنگی قژی زەرد یا رەشە چونکە شاعیر وتوویە قژی رەنگی حەزی منە لە وێنەکانی دواییدا دیارە کە حەز و بەختی ئەم زەرد و ژاکاو یاخود رەشە چاوەکانی دۆزەخن و دەستەکانی پڕ لە خۆڵەمێش، ئەمە وەك تابلۆیەکی سریالی نیشان دەدات. حەز و ئارەزووەکانی شاعیر گۆرانی مەرگ بۆ خۆی دەڵێتەوە. جگە لەوەی کە رێگەی -مستحیل لە بەیەکگەیشتنی خۆی و خۆشەویستەکەی رەچاو دەکات و دەست گەیشتنە ئەو وەك دەست گەیشتنە هەوری لێ دێ کە دیارە ئەمەش نەگونجاوە و ناشێ رووبدات، لە بەشی یەکەمدا شاعیر راستگۆیانە هەست و سۆز و ئازارەکانی دەروونی خۆی نیشان داوە هەرچەندە کە بریتییە لە چەند وێنەیەکی تاریك و رووخان و بێ هیوایی و مستحیل لە بەردەمی هەنگاوەکاندا دادەنێت منداڵێك دەبێتە دەمامك (قناع) mask شاعیر لە پشت ئەو تابلۆ سریالی-یەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ ژیاندا دەکات. بەڵام لە بەشی دووەمدا باران دەبێتە رەمزێکی بەهێزی شیعرەکە، شاعیر زۆر بەشارەزایی و وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵ رەمزی باراندا کردووە جێگەی موناسیبی خۆی بۆ دۆزیوەتەوە و دەلالەتە رەمزییەکەی باران کە رەمزی خێرو پاکژکردنەوەی شتەکانە خۆی پێکاوە جگە لەوەی شاعیر دەیەوێ ئەم حاڵەتە بەردەوام بێت باران هەر بباری هیچ شتێك نەمێنێ بەپیسی و خراپی هەموو شتێك پاك ببێتەوە شاعیر دەلالەتە رەمزییەکەی بەهێزتر بەکاردەهێنێ کاتێك دوای ئەوە.

با ئیتر باران نەوەستێ
باران لە دڵی کەس نادا
ئیتر چۆن خۆشەویستی سەوز نەبێ؟!
یاخود نەمرێ؟!
ئەویش واگۆنێکی تەڕە
تیشکێکی رەنگ مردووی تیایە

پڕە لە عیشقی ڕەنگاو ڕەنگ
مەلێکیشی دەنگی نایە

بەڵام نازانم بۆ شاعیر مۆنتاجی شیعرەکەی نەکردووە دەستەواژەی (یاخود نەمرێ) بەنەشازی لە بن ئەو واتە جوانەی سەرەودا قوت بووەتەوە. ئەو دەیەوێ خۆشەویستی سەوز بێت، ئیتر چۆن دەیەوێ بمرێ، کە دەڵێت- چۆن نەبێ یاخود نەمرێ.

دوایش لە غەفڵەتا تووشی هەمان دژواری بۆتەوە کە دەڵێت:

«تیشکێکی ڕەنگ مردووی تیایە
پڕە لە عیشقی ڕەنگاورەنگ

کە تیشك ڕەنگ مردوو بێت چۆن عیشقی ڕەنگاورەنگی تیا دەبێت؟

دیسانەوە لە شیعری گیانێکی تەزیو-دا کەوتۆتەوە هەمان غەفڵەت و تووشی دژوارییەکی زەق بووەتەوە. کاتێك لە سەرەتای پارچە شیعرەکەدا دەڵێت:- «ئەمشەو لام بە مەرۆرەوە، کەچی هێندە نابات دوای ئەو نووسینەوەیە من چاوەڕێتم تاکو بێی. ئینجا کە ئەو شەوە لای شاعیری بێت حەز دەکات نەڕوا و بەجێی نەهێڵێ چۆن دەبێ- چاوەڕێی بکات هەتا بێت بۆ لای؟! تەنانەت شاعیر جەخت لەسەر ئەو ژوانەش دەکات و تکا لە خۆشەویستەکەی دەکات و دەڵێت- بەم درەنگە مەرۆرەوە ئینجا بەمەدا دیارە کە نەك ئەو شەوە لای بووە بەڵکە ئەمەندە تامەزرۆی یەکتر بوون تا درەنگیش ماونەتەوە. لەلایەکی کەوە وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد شاعیر خاسێتێکی باش و گەش و زیندووی داوە بە بەشێکی زۆری شیعرەکانی ئەویش خاسیەتی بەردەوامییە- (الاستمرارية) بەردەوامی لە حاڵەتە باش و ئیجابییەکاندا کە مایەی دڵخۆشییە و بەپێچەوانەی گەلێ شاعیرەوە کە بەداخەوە گۆشەنیگای ورە بەردان و ڕۆشنبیرییەوە بەردەوامی ئیجابی و بەرەو ڕووناکی و باش چوون لای ئەم شاعیرە.

(با ئەم عیشقە لەسەر ئەو شۆستەیە نەنوێ
ڕێبوارەکان دایناپۆشن
سەرمای ئەبێ)

شاعیر لێرەوە بەردەوامی ئەداتە حاڵەتە ئیجابییەکەو هەر تەنها ئێستای مەبەست نییە بەڵکە دەبێتە خەمخۆری هەنگاوی دوارۆژ و بەچەند وێنە شیعریی جوان ئەو داهاتووە گەشەی دیاریی دەکات.

(ئەگەر ئەمجارە مانگ هەڵهات
لە ژێر تاڤگەیا خۆت بشۆ
بە دڵۆپەکانیا هەڵزنێی
گۆرانیت چریکەی تیشکی بێ و
بەجێی ئەهێڵێ ڕەنگ و بۆی)

شاعیر لە کۆتایی شیعری- گیانێکی تەزیودا مامەڵەیەکی زیرەك لەگەڵ تابلۆیەکدا دەکات زۆریەمان ئەو تابلۆیەمان بەدیواری مالان و دوکان و پێشانگاکانەوە دیوە، دێت حالەتی بەردەوامی بزواندن و جووڵە (حركة)- ئەخاتە ناو تابلۆ بێ جووڵەکەوە و ئەوە دیاری دەکات کە بێ جووڵەیە بەلام جووڵە و بزواندن و بەردەوامییەکە دەبەخشێتە ئەو چەند دڵۆپە فرمێسکە بەچاو و ڕوومەتی منالەکەوە قەتیس ماون لە هەمان کاتیشدا ئەم حالەتی بزواندن و ژیان و بەردەوامییە دەبەستێتەوە بە عیشقێکەوە کە هەموو وجوودی بزوتن و ژیان و گەشەسەندنە:

(تابلۆیەك وا بەدیواری بەر دەممەوە
منالێکە فرمێسکی گڕ ئەکاتەوە
ئەڵێی عیشقی من و تۆیە
بێ جووڵەیە و
کەچی خۆشیش ناکاتەوە)

سەلاح محەمەدی شاعیر لە بەردەوامی گەشەسەندن و گیان کردن بەبەر تابلۆ و دیمەن و شتەکاندا جوانی دەبینێ، ئەمەش لە خۆیدا یەکێکە لە ستوونە بنەڕەتییەکانی شیعر، هێنانی دیمەنی جوان و مامەڵەکردنی شاعیر لە تەکیا و تەجسیدکردنی ئەو خەیاڵەی لە بیروهۆشی شاعیردا خۆڵقاون ڕەنگێکی تایبەتی شاعیرێتی ڕەسەن لای شاعیر دروست دەکات، بزانە چۆن ئەم تابلۆیەی سروشتی گواستۆتەوە ناو تابلۆی شیعرەکەی چەندە شاعیرانە مامەڵەی لەگەڵدا کردووە

ئەوەتانێ
لە خەیاڵما
کەروێشکەی ئەو گیایە ئەڵێی
ئەو ئێوارە شەرمنەتە

لەژێر هەستما ئەبزوێ
درەنگانێ کە ماندوو بووم
بڕچی هێوری پەخش ئەکا و
هێدی هێدی لێی ئەخەوێ)

لێرەدا دەپرسین ئایا جوانی چییە؟ لە کوێوە پەیدا دەبێ؟ شت هەیە خۆی جوان بێ یا لە چاوی ئێمەوە هەر کەس بەلای خۆیەوە جوانی دەخولقێ هەریەك ڕەنگێ، دیمەنی شتێ لای جوانە ڕەنگە لای یەکێکی کە جوان نەبێ و ئەو بەهایەی نەبێ، بەلام هەنگاوێکی زۆر شاعیرانە و سەرکەوتووە کە شاعیرێکی وەکو سەلاح محەمەد- لە شیعرێکیدا جیهانێك ببەخشێنێ کە هەموو شت تیایدا نەك جوانی بێت بەڵکو جوانییەکانیش خاوێن بن، لەم بارەیەوە- (ئەلفریدی موسیە) لە وەلامێکدا کە بۆ (بوالوی) نووسیوە دەڵێت (هیچ هەقیقەتێك نییە جگە لە جوانی، هیچ جوانییەکیش نییە بەبێ هەقیقەت)[٤] لە ڕۆشنایی ئەم واتایەوە دەڵێین ئایا، ئەو جوانییانەی لەم شیعرەی -سەلاح-دا خولقاوە هەقیقەتە، یاخود بڵێین هەقیقەتی شتەکان و مەسەلە ئاڵۆزەکانە یاخود ئایا توانیویە بەرجەستەی هەست و سۆز و عاتیفە هەژاو و هەڵچووەکەی دەروونی بکات و وێنەکان و هەقیقەتی شتەکان شاعیرانە ئاوێتە بکات و زۆر سیحرییانە لە تێکڕای ڕەنگەکان ڕەنگێکی تایبەتی و سەرنجڕاکێش دروست بکات، لە وەلامدا دەڵێم، بەڵێ توانیویە، بەڵگەش بۆ ڕاستی ئەم ڕایە تەنها شیعرەکە خۆیەتی کە دەڵێت:

«تۆ ئەڵێی شیعری گۆرانی
لە بن ئەستێرەکانا دانیشتووی
لەگەڵ مانگدا لە جێ ژوانی
تۆ فریشتەی
تۆ نهێنی خۆشەویستی ئەو بەهەشتەی
هێشتا چۆڵە
هەتا ئێستاش چاوەڕێی
وەراندنی هەورەکانە بۆ ئەم خۆڵە»

# بەشی سێیەم

سەلاح محەمەدی شاعیر زۆرجار بە شاعیری وێنە ناودەبرێت، ئەمەش لە خۆیەوە نەوتراوە و ئەنجامی ئەو بایەخدانەی شاعیرە بەوێنەی شیعریی. لە ڕاستیدا شیعرێکی نییە چەندین وێنەی شیعری جۆربەجۆری بەکارهێنابێ هەر خۆی لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەریدا لەم بارەیەوە وتوویە:

(حەز ئەکەم ئەو شیعرەی ئەینووسم لە کاتی خوێندنەوەیدا خوێنەر هەست بە جووڵەی وشەکان و مۆسیقای شیعرەکە بکات و لای خۆی وێنەیەك دروست بکات لە نێوانی خۆی و شیعرەکەدا هەروەها ئەو وێنە شیعرییانە دابین ئەکەم وێنەی دیارن و لە ئاڵۆزی و داپچڕان و دابڕان دوورن) شاعیر لە ساتەکانی هەڵچوونی دەروونیدا وێنە (غیر مرئي) و نهێنییەکانی خەیاڵی دەهێنێ و بەشێوەیەکی مەحسوس و مەرئی دابینیان دەکات بەشێوەیەکی هونەری بەرجەستەیان دەکات. چونکە بەتەنها وێنەی شیعری لێرەدا مەرج و گرنگ نییە بەڵکو گرنگتر ئەوەیە کە ئایا چۆن و لە کوێدا شاعیر لە شوێنی موناسبی خۆیاندا دایان دەنێ و تەبایی لە نێوانیاندا دەدۆزێتەوە شاعیر بەچاوی هەست شتەکان دەبینێ، شاعیر گیان دەبەخشێتە ئەو ڕواڵەت و شتانەی بێ گیانن و لە دوو شتی جیاواز و سیفاتی تایبەتی جیاوازییەك شت دروست دەکات، یاخود بڵێین، ئیدیۆمەکان خۆیان مەبەستێك ببەخشن بەڵام لای شاعیر ڕەنگ و سیفاتی جیاوازتر وەردەگرن و ئەرك و کاری ئاسایییان نائاسایی و لە قەوارەی سروشتی خۆیان دەردەچن لێرەدا ئەم چەند نموونەیە دەنووسین:

سەیری ئەو ئاوازە شیرینە
بۆ ئەوەندە قژی خاوە
چاوەکانی داگیرساون
سووراوی ڕووی
پەنجەکانی خورماوە
دەخیلتم کچە بەفرەکەی میوانم
بەم درەنگە مەڕۆرەوە
هێور داباریێ سە ڕۆحم

ئەو چرایە داگیرسێنە
ئەم بێدەنگیەش بدڕێنە
ئەوا نم نم سۆز دەڕژێتە
کلاورۆژنەی تەنیاییم
نەکەی ببیتە بەربەست و
یان ئەوەستێ بۆ ساتێکیش ماڵئاواییم!
دڵێکی شکاو هاڕەی دێ
ئەوە مناڵێکی چەتوونە

لە بارەی وێنەی شیعری و گۆڕین و یاری پێکردنی وشە و ئیدیۆمەکانەوە شاعیر گەلێ واتای دروست کردووە کە مانا نادەن و گونجاویش نییە! بەڵام ئایا شاعیر بۆچی ئەمەی کردووە چۆن لای ئەو گونجاوە:

بۆ نموونە:

«خۆت ئەخش کە بەسەر هەستی. بووکە شووشەی پێکەنین. شەوێکی ئیجگار داڕزاو، دەبێتە پاڵتۆیەکی کۆن باراناویش لەبەری ئەکا. ڕووبارەکان دەنێتە سەر ئەرەی شانی گۆشتی شەوگار کون کون دەکا. بە دڵۆپەکانیا هەڵزنیی، ئەو بارانە توند دەکا شان و قۆڵم ئەوەرێنێ، تۆ خەمێکی بە لەرزەتی، خەمی تەنیاییمە نم نم لەسەر لێوانت باریوە، وا تێکەڵی یەکتربووین چاوەکانمان بوومتە هێشوو، ئەچێتە کاسەی سەرمەوە. ئەو چەمانە گڕ تێبەرە گەر هێمنی سەربڕیو، پەنجەکانی خۆرهتاوە» ئیتر بەم شێوەیە گەلێ لەو واتایانە دێنێ و هەم دەیانکاتە وێنە هەم سیفاتی بزواندن و ئەنجامدانیان پێ دەبەخشێت. لە بارەی وێنەی شیعرییەوە. دۆکتۆر (مجید عبدالحمید ناجي) لە لێکۆڵینەوە زانستییە بەرفراوانەکەیدا وێنە دەکات بە دوو بەشەوە (وێنەی ڕاستەوخۆ، وێنەی ناڕاستەوخۆ، (المباشر و غير المباشر)، وە لە بارەی ئەو دوو جۆر وێنەیەوە دەڵێت: «ئەگەر بێت وێنەی ڕاستەوخۆ بەوێنەی فۆتۆگرافی دابنێین ئەوا وێنە یاخود وێنەگرتن یا وێنەکردنی ناڕاستەوخۆ وەها ببینین کە تابلۆیەك بێت هونەرمەندێکی داهێنەر دای هێنابێ ئەو تابلۆیە هەموو شتە هەست پێکراوەکانی دەوروبەر وەك خۆی چۆنە وەها نایگوێزێتەوە بۆ لای خۆی بەڵکو هونەرمەند لێی زیاد دەکات و دیسانەوە خۆی پێکی دەهێنێتەوە بەو شێوەیەی لەگەڵ هەست و هۆش و بەهرەکەیدا بگونجێ و تێکەڵ بێت. بەم جۆرە تابلۆکە دەبێتە ئاوێنەیەك لە واقیعی شتەکانی

دەروبەر و واقیعی هونەرمەندە کە خۆی) دواجار کە تەماشای ئەك ئەم چەند پارچە شیعرە بەڵکو ئەگەر گەشتێك بەشیعرەکانی شاعیردا بکەین دەبینین بەشێوەیەکی فراوان لەگەڵ وێنەی شیعریدا خەریکە مامەڵەیان لە تەکدا دەکات وێنە زەنی و خەیاڵییەکان بەرجەستە دەکات و لە حاڵەتی -غیر مرئي و غیر محسوس-ەوە واتا نەبینراو و هەست پێ نەکراوەوە دەیانکاتە بینراو هەست پێکراو ئەمە جگە لەوەی کە دەبێ بزانین وێنە شیعرییەکانی شاعیر بوونەتەوە هۆی نزیکبوونەوەی زیاتری شیعرەکان لە هەست و هۆشی خوێنەر و زیاتر چەسپاندنیان لە مێشك و دەروونداشاعیر ئەگەر جوانترین وێنەی سروشت وەك خۆی بگوێزێتەوە ناو تابلۆکەی ئەوا ناتوانین بڵێین کارێکی هونەری کردووە بەڵکو کارە هونەرییەکە ئایا چۆن ڕوحی هونەری (سەلیقە و زەوقی هونەری خۆی تێکەڵ بەوێنە سروشتییەکە دەکات و چۆن ڕۆحی لەگەڵیا تێکەڵ دەبێ و دوایی کام وێنەی هونەریمان بۆ ئامادە دەکات؟!

لە کۆتایی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا دەبێ شاعیر و خوێنەر لەو واتا و تەعبیرانە ئاگادار بکەینەوە کە هەندێکیان شیعریی نین یاخود هەندێکیان لە کۆپلە شیعرییەکان بچڕاوێن یاخود لەنگ دێتە گوێ و کێش و ئاواز و هارمۆنییەتیان زیندوو نییە بۆ نموونە دەڵێت:

-ئەجێگایەکم لەلای خۆی بۆ دائەنێت.

ئەو ڕووبارە
جێی کانییەکی کەی ئابێ
ئەگەر ئەمشەو حەزی دەروێش
لە دەرگای ماڵی شێخ ئەداو
ملی بۆ مەیلی ئەدابێ»
«لە ماڵی عیشقی گڵی سارد و سڕما
تا وەنەوزێکی تیا نییە»
گۆرانییەکی سۆز ئامێزی بۆ بڵێ؟

(گوێم لە جیرەی درەختێکە) کە جیرە بۆ دەرگا یا شتێکی کە دەبێ و بۆ دەنگی درەخت دەوترێ گوێم لە ناڵەی درەختێکە «با هەست بەپەنجەیەکان نەکەین، سەریشمان ئەمشەو سپی بێ»

(ئەمە و خەیاڵی بەرزەفڕ

(نازیزەکەی هەڵواسیوی)

(دەمنا دەکەویە سەر زەوی

دەزوولەکان دەتخەنە ناو سنگیانەوە)

شاعیر ئەگەر زیاتر خۆی ماندوو بکات و خۆی زیاتر لە جەنجاڵیی خوێندنەوەیەکی بەردەوامی قووڵدا ببینێ و بەگەرمی بتوانێت ئاوڕێك لە ئەدەبی میللی یا ئەدەبی فۆلکلۆریمان بداتەوە و هەوڵ بدات کە گەلێ هەقیقەتی مێژوویی و داستان و ئەفسانەی نەتەوەییمان بەکاربهێنێ و وێنە و پەیکەری شیعری بە سەلیقە شیعرییەکەی خۆی لێ دروست بکات ئەوا بێ گومانم کە دەچێتە ریزی پێشەوەی شاعیرەکانی سەردەمەکەی خۆی و هەمووشمان هیوامان بەو دواڕۆژەوە هەیە و شیعریش لەم ڕۆژگارەدا گۆشەگیر نییە و لەسەر زەویدا دەژی، بۆیە دەبێ شاهیدێکی ڕاستگۆی کارەساتەکانی ڕۆژگارەکەی خۆی بێت و ئەوەندەی لەباریا بێت ئاوێنەی ژیان بێت و ڕووناکی بەخش بێت.

سەرچاوەکان:


١- نموونەی شیعرەکان لەو سێ شیعرەوە وەرگیراون کە لە ڕۆژنامەی ژمارە-٥٤، ٦٥، ٧٢-ی عێراق-دا بلاوکراونەتەوە.

٢- فلسفة الادب و الفن-د. کمال عید، ص٥٥

٣- فەلسەفەی جوانی و هونەری لاپەڕە -٩٨-

٤- الرومانتیکیة د محمد غنیمی هلال ص١٧

٥- ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە -٨٩١-ی ١٤، ٥، ١٩٨٧ العدد ٨- السنة ١٩٨٤-٦، ٧- صورة الشعریة، د. مجید عبد الحمید ناجي-مجلة الاقلام العدد-٨- ١٩٨٤-

# بەرخودانی هزر و دیمانەی خوێن

## لە شەشەمین ساڵڕۆژی شەهیدبوونی مووسا ئەنتەردا

### شەوی ماتەم:

دەبوا شەوی ماتەم نەبوایە، چونکە ڤیستیڤاڵی کولتووری ساڵانەی شاری کوردپەروەری دیاربەکر بوو، پاش ئەوەی لەو بۆنە نەتەوەییەدا مووسا ئەنتەر وتاری ئاگرینی خۆی پێشکەش کرد، لە گەڕانەوەیدا لە گەڕەکی (سەیرانی تەپە)ی ئەو شارە کەوتە بەر شاڵاوی دڕندانەی دوژمنانی دێرینی گەلی کورد و بەچوار گوللە شەهیدیان کرد، هەرچەندە ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی پرشنگدار و لە ڕەنگی ئاسایی خۆی گەش و جوانتر بوو، چونکە ڕۆژی۲۰/۹/۱۹۹۲ یادەوەری ساڵگەردی پەیڤی پیرۆزی کوردی بوو، بەڵام بەداخەوە دوژمنان ئەم ڕۆشناییەیان بەشەوی ماتەم گێڕاو مووسا ئەنتەر چووە کاروانی شەهیدانەوە.

### ژیان و بەرهەم:

مووسا ئەنتەر ساڵی ۱۹۱۸ لە دێی (ئیستبلیلی) لە خوارووی تورکیا سەربە (نوسەیبین) لە دایك بووە، دوای تەواوکردنی کۆلیجی یاسا بووە بەپارێزەر و چەند ساڵێ بەم پیشەیەوە خەریك بووە، هەر لە سەرەتاوە بۆیە بیری لە کاری پارێزەری کردەوە چونکە ئەو بڕوانامەیە ڕێگەی پێ ئەدات کە ئیمتیازی ڕۆژنامە یاخود گۆڤار وەرگرێت. لە ساڵی ۱۹۸٤ ڕۆژنامەی دجلە کابناغی بڵاوکردەوە، ڕۆژنامەکە هێشتا چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچوویوو کە ڕژێمی ڕەگەزپەرستی تورکە کەمالیستەکان قەدەغەیان ڕاگەیاندرو دایانخست، خاوەنەکەشی کە (مووسا ئەنتەر) بوو خرایە بەندیخانەوە. ساڵی ۱۹٤۳ لەسەر ئەوەی شیعر و ئاوازێکی کوردی بۆ سروودی قوتابخانەیەکی دیاربەکر پێشکەش کردبوو دەسگیر کراو بگرە لەسەر ئەمە ئەشکەنجەش درا. ساڵی ۱۹٥۹ یەکەم شیعری بەزمانی کوردی لە ڕۆژنامەی (وڵاتێ پێشکەفتی) بڵاوکردەوە، دیسانەوە ڕۆژنامەکە داخراو خۆیشی بەندکرایەوە. چونکە بەپێی بڕیاری ژمارە ۳۹۳۲ لە یاسا و دەستووری تورکیادا نووسین و گفتوگۆ کردن بەزمانی کوردی قەدەغەیە و بەتاوان دادەنرێت.

سالی ١٩٥٦ شانۆیی (برینا ڕەش)ی نووسی لە شاری ئەستەنبوڵ لەسەر شانۆ نمایش کرا. هەروەها ئەم بەرهەمانەی لە ژیانی خۆیدا بڵاو کردۆتەوە "ژووری مەرگ، بیرەوەرییەکانم، فەرهەنگی کوردی- تورکی، ناوی کتێبەکانیشی بەم جۆرەیە: برینا ڕەش، حوجرا مرنی بیر هاتنێت من، قامۆسا کوردی. مووسا ئەنتەر پەیوەندی بەپارتی (H.E.P)ەوە هەبووە. جگە لەوەی کارگێڕی (ئەنستیتۆی کورد) بوو لە ئەستەمبوڵ. هاوڕێ و هاوکاری هەمیشەیی خەمخۆری کورد (ئیسماعیل بێشکچی) بوو، پێکەوە کاریان دەکرد. بەتایبەتی کە مووسا ئەنتەر نووسەرێکی بەردەوامی ڕۆژنامەی (OZGAR YENIULKE) و (DUNDEM) بوو، تیایدا گۆشەیەکی تایبەتی تەنزی سیاسی هەبوو، بەناونیشانی (مزاحیت سیاسی)، خۆی لە بارەی ئەم گۆشەیەوە دەڵێت: «ئەم گۆشەیە وەك كەلوپەل و كەرەسەی قاچاغ و قەدەغە وەهایە زوو دەگیرێت و زوو دەفرۆشرێت هەتا مەبەستی خۆی بگەیێنێت». مووسا ئەنتەر گرنگی و مەترسی ئەرکەکانی خۆی دەزانی و لەو بەرەنگاربوونەوەیەدا شەهیدبوونی خۆی لە بەرچاو گرتبوو، بۆیە هەمیشە دەیگوت (کەلووی شەهید بوون بیە نەسیبی من ژی". هەواڵی شەهیدبوونی ئەم ڕۆژنامەوان و نووسەر و شاعیرە کورد پەروەرە هەر زوو بەکوردستانی تورکیا و جیهاندا بڵاوبووەوە، خۆپیشاندانی فراوان لەم شارانەی تورکیا ڕێکخراو پەنجەی تاوان بەرەو ڕووی ڕژێمی فاشستی تورك كرایەوە، وەك شارەکانی دیاربەکر، باتمان، بەتلیس، قولب، لیجە، نوسەیبین، لە شاری قولب داواکارییەکی گشتی کوژراو داوای دادگایی کردنی تاوانباران کرا.

## حسامی لە مووسا ئەنتەر دەدوێ:

مامۆستای دوورە وڵات و کورد پەروەر (کەریمی حسامی) لە بارەی مووسا ئەنتەرەوە نووسیویە: مووسا ئەنتەر لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە تا ڕۆژی شەهیدبوونی لەگەڵ دەرد و ژان و ئازاری نەتەوەکەی ژیاو ستەم و دڕندەیی ڕەگەزپەرستانی تورکی بەچاوی خۆی دەبینی و بەگۆشت و ئێسقان دەیچێشت. شەهید مووسا ئەنتەر هەر لە کاتی فامکردن و پێ گرتنیدا هەر لەگەڵ سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی حکوومەتی ڕەشی ئەتاتورك بەرەو ڕوو بوو، کە بۆ تواندنەوە و لە بەینبردنی نەتەوەی کورد بەڕێوەی دەبرد، لە سەردەمێکدا فامی دەکردەوە کە زمانی کورد وەك ئێستای قەدەغە دەکرا، شوێنەواری کەلتووری کوردی کوێر دەکرایەوە، هەزاران خاو و خێزانی کوردی بەزۆری لەسەر زێد و نیشتمانی

خۆی هەڵمەکەنراو لە نێو شار و گوندی تورکەکاندا پەخش و بڵاو دەکران.

شەهید مووسا ئەنتەریش لەگەڵ بنەماڵەی خۆی کەوتە بەر ئەم پەلامارە درندانەیە و لە کوردستـان ئـاوارە کرا لـە شاری ئـەدەنـە نـیشتـەجـێ کران. لەو شارە قوتـابخـانـەی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی تەواو کردو بۆ خوێندنی بالا چووە ئەستەمبووڵ و لە زانکۆی حقوق زانستگای ئەستەمبوول لیسانسی حوقی وەرگرت. شەهید مووسا ئەنتەر تا دوا ڕۆژی ژیانی چ وەك نووسەر چ وەك ڕۆژنامەنووس لە بەرامبەر مافی نەتەوەیی و کولتووری ئینسانی گەلی کورد لەگەڵ تورك خەباتی کرد لە بەرامبەر ملهوڕ و چەکمە ڕەقی ڕەگەزپەرستانی تورکدا لە چۆکا نەهات و کۆڵی نەدا(١).

## یەشار کەمال لە شەهیدکردنی مووسا ئەنتەردا بەدەنگ دێت:

کاتێك مووسا ئەنتەر لە ١٩٩٢/٩/٢٠ لە دیاربەکر بەچوار گوللە تورك شەهید کرا (یـەشار کـەمـال)ی ڕۆمـانـنووس و هـاوڕێی کـاروانی تێکۆشانـی ئـەنتـەر لە ڕۆژنـامـەی (جـمـهوریـەت) لـە (٢)ی ئـوکتـوبـەری ١٩٩٢دا وتـارێکی بـەزمـانـی تورکی بڵاوکردەوە. وتـارەکە زۆرە و مـاوە نییە لێرەدا هـەمووی بڵاوبکەینەوە، ئەمە تەنیا چەند بڕگەیەکە لە وەرگێڕدراوی کوردیی وتـارەکەی یـەشار کـەمـال- لە موناسەبەی شەهیدکردنی مووسا ئەنتەردا بەناونیشانی (کوردەکان داوای مـافی ئینسانی خۆیـان دەکەن).

یەشار کەمـال نووسیویە:

" لەوانەیە بڕوایەکی سەیرم هەبێ ئەویش ئەوەیە من قەد بڕوام نەدەکرد کە هیچ ئینسانێك تەنانەت ئەگەر خوێنخۆر و پیاو کوژیش بێت سەدان کەسیشی کوشتبێ بتوانێ کەسانی وەك مووسا ئەنتەر پەلامار بدا و بکوژێ. من کاتێك مووسا ئەنتەرم ناسی کە تەمەنی ٣٢ ساڵ زیاتر نەبوو لەو کاتەوە ئێمە پەیوەندی دۆستایەتیمان هەبووە، ئەو مرۆڤێك بوو هەمیشە بەچاوی خۆشبینی سەیری جیهانی دەکرد، تەنانەت لە ڕۆژەکانی ڕەش و دژواریشدا هـەر بـەکـەیـف و پڕ لـە هـیـوا و بـڕوا بـتـەویـوو. بڕوای بـەکـەلـتووری نەتەوەکەی هەبوو، هەروەها لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە کەلتووری میللەتەکەی یارمەتی بەکولتووری جیهانییەوە کردووە و دەیکات، هەر بەتەواوی لەگەڵ ڕەگەزپەرستی بێگانە نەبوو، هەرگیز نەتەوەپەرستی لەگەڵ ڕەگەزپەرستی تێکەڵ نەکرد، تا دوا ڕۆژی تەمەنی هەر سۆسیالیست و دیموکرات مایەوە. کوردەکان گشتیان بە "ئاپۆ مووسا گازیان دەکرد، من لام وایە کە ڕێکەوتی نێوان تورك و کوردان ئەوەندە دژوار نییە. ئەوەی کە ئەم

مەسەلەیە تووشی تەنگ و چەڵەمە دەکات لە ڕاستیدا بریتییە لە زوڵم و ستەمێك کە هەشتا ساڵە بەردەوامە. کورد ئەدەبیاتی تایبەتی خۆیان هەیە ئەم ئەدەبیاتە لە سەردەمی ڕابردوودا بڵێسەی داوە بەکۆمەڵی مرۆڤایەتی. ئەوان ناو و ناوبانگی جیهانییان هەیە، (ئەحمەدی خانی) شاعیری گەورەی سەدەی چوارەدی زاینی یەکێ لەو بلیمەتانەیە. پاشان دەبێ شیعرەکانی سەدەی دوانزەی زاینی باس بکەین، مەلای جزیری، فەقێ تەیران لەوانەن، گوڵکۆی ئەو شاعیرانەی باسم کردن ئەنادۆڵی ڕۆژهەلات، واتە کوردستانی تورکیایە. هەروەك گۆڵکۆی پێغەمبەر و پیاوچاکان جێگای زیارەتن و ساڵی سەدان هەزار دەچنە ئەو شوێنانەوە سەدان مەڕ دەکەنە قوربانی. ئەدەبیاتی ئەناسراوی کوردەکان فرە دەوڵەمەندە، داستانبێژی حەماسی لە دنیای ئیمڕۆدا تەنیا لە نێو دوو میللەتدا ماوەتەوە، لە نێو کوردەکان و قیرقیزەکان (قەرقزیا). گۆرانی و شیعری پڕ ئاواز و شێوەی سکالا، مەلۆدی و چیرۆك و ئەفسانە و فۆلکلۆری کوردی ئەگەر لە فۆلکلۆری تورك دەوڵەمەندتر نەبن، لەو کەمتر نین. لە بواری کولتووریدا جیهان وە باخێك دەچێ بەهەزار گوڵەوە، هەر گوڵەی خاوەنی ڕەنگ و شکڵ و بۆنی خۆیەتی، ئەگەر لەم هەزار گوڵە یەکێکیان لە بەین بچێ کولتووری مرۆڤایەتی لە ڕەنگ و لە عەترێك بێ بەش دەبێ. داخوا ئێمە بەڕاستی دەتوانین بەقەدەرایی مووسا ئەنتەر وڵاتەکەمان خۆش بووێ؟ من بڕوای تەواوم بە مووسا ئەنتەرەکانی ئەم وڵاتە هەیە[٢]

## فەرهەنگا کوردی -تورکی (١٩٦٧)

لە مێژووی فەرهەنگ نووسی کوردیدا ئەمە یەکەم فەرهەنگە بەکوردی و تورکی. مووسا ئەنتەر ساڵی -١٩٦٣- لە دانانی ئەم فەرهەنگە بووەتەوە، بەڵام نەیتوانیوە چاپی بکات تا ساڵی ١٩٦٧، بەداخەوە ئەم فەرهەنگە بەنرخ و پڕ بەهایە ژمارەیەکی زۆر کەمی لە تورکیا هاتە دەرەوە، لەوێ پاش ماوەیەك قەدەغەکراو کۆکرایەوە. کتێبخانەی کوردی بەتایبەتی لای خۆمان لەم فەرهەنگە گرنگە بێ بەشە. بایەخی ئەم فەرهەنگە تەنها لەوەدا نییە کە (١٠) دە هەزار وشەی تێدایە. بەڵکو لەم خاڵانەدایە کە ئێمە دەستنیشانی دەکەین:

١- ئەم فەرهەنگە وەك ئینسکلوپیدیایەك وەهایە ناوی سەدان شار و شارۆچکە و دێهات و تیرە و چیا و ڕووباری کوردستانی مەزنی تێدایە.

٢- تەنیا فەرهەنگێکە بەکوردی و تورکی.

٣- چەندین ناوی کوڕ و کچی کوردی تێدایە.

٤- سەدان وشەی کوردی ڕەسەنی دۆزیوەتەوە.

٥- فەرھەنگەکە بەپیتی لاتینی نووسراوە بەکوردی و بەتورکی.

پێشەکی (پێشگووتن)ێکی بۆ نووسیوە لە لاپەڕە شەست ھەتا سەد و شەست و سێ دەقی تەواوی فەرھەنگەکەیە پێنج لاپەڕەی کۆتایی بۆ گرامەری کوردی تەرخان کردووە. نووسەر نووسیویە:(٣)

پیتی کوردی بریتین لە ٣٢ لە مانە ھەشتیان بێ دەنگن. ھەروەھا دەڵێت لەبەرئەوەی دوو دەنگی کوردی (فۆنەتیك)ی بۆ دانەنراوە نەمتوانی دەری ببرم. ھەروەھا لەو لاپەڕەیەدا (دیمەن) وێنەیەکی بڵاو کردووەتەوە بریتییە لەو پیتانەی کە کورد لە پێش ئیسلامدا بەکاریان ھێناوە لەگەڵ پیتی ئیسلامی - عەرەبیدا ھەردووکیان لە ناو یەکداو بەرامبەر یەکتر کردووە، دانەری فەرھەنگ شەھید مووسا ئەنتەر لە (پێشگووتن)دا بەکورتی نووسیویە:

" ئەم فەرھەنگەم لە ساڵی ١٩٦٣دا لە ئەنقەرە نووسیوەتەوە. لە ڕاستکردنەوەی وشەکاندا ھاوەڵێکی خەڵکی ھەولێر (جەمال عەلەمدار) یارمەتی دام بۆیە سوپاسکردنی بەقەرزی سەرشانم دەزانم. ھەرچەندە لە کاتی نووسینەوەی ئەم فەرھەنگەدا تووشی دەربەسەری ھاتووم، بەڵام کۆڵم نەدا ھەتا توانیم بیھێنمە بەرھەم. فەرھەنگ نووسینەوە ھەروا ئاسان نییە، جاری وا ھەیە فەرھەنگێك دە پازدە جار بەدەستکارییەوە چاپ دەکرێتەوە، ئەوسا تەواو پوخت دەبێت و قاڵبی خۆی دەگرێتەوە، من ئێستا وا ئەم ئەرکەم خستە سەرشان ئەگەر نەمردم ئەوا بەپوختکراوی چاپی دەکەمەوە، یان پاش من کەسێکی تر دەبێت بتوانێت ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ"(٤) "فەرھەنگا کوردی-کوردی" لە ئەستەموڵ لە چاپخانەی ینی مطبعە بەقەوارەی ١٦٨ لاپەڕە چاپ کراوە لەسەر بەرگی کتێبەکە وێنەی کورد و تورکێك بە بەرگی نیشتمانی خۆیانەوە ڕازاوەتەوە". ھەروەھا لای خۆمان دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف لە کتێبی "وشەی زمانی کوردی"دا بەکورتی پێناسەیەکی ئەم کتێبەی کردووە بەداخەوە دەستی ڕەشی تیرۆر ئەم نووسەر و کورد پەروەرەی شەھید کردو نەیانھێشت ئەم دوو بەرھەمەی خۆی بەچاپ بگەێنێت.

١- گراماتیکی زمانی کوردی.

٢- فەرھەنگا تورکی-کوردی.

درورد بۆ گیانی خاوێن و نەمری مووسا ئەنتەری ئەدیب و فەرهەنگنووس و ڕۆژنامەوانی دڵسۆز بەخاك و نەتەوە.

**سەرچاوە و پەراوێز:**

١- گۆڤاری (وان) سوید، ستوکهۆڵم، ژمارە (٧) ساڵی ١٩٩٤، ل٥، یادێك لە مووسا ئەنتەر کەریمی حسامی.

٢- هەمان سەرچاوە -لاپەڕە (٦) ناونیشانی کوردەکان داوای مافی ئینسانی خۆیان دەکەن، یەشار کەمال، ڕۆژنامەی -جمهوریەت- ٢ی ئوکتۆبەری ١٩٩٢.

٣-مامۆستای خوالێخۆشبوو -مستەفا نەریمان- ئەم بڕگانەی لە تورکییەوە کردبوو بەکوردی. ئێمە لێرەدا سوودمان لێ وەرگرت.

٤- سەرچاوەی پێشوو (پێشگوتن) پێشەکی نووسەر.

تێبینی:

لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئەم ڕاستییە وە بیر بێنمەوە. لە "ساڵی ١٩٩٢ لە مانگی شوبات هەتا شەهیدکردنی مووسا ئەنتەر (٩) نۆ کاری تیرۆرکردن ڕووی دا، ڕۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز لە ١١ی ئوکتۆبەری ١٩٩٢دا نووسیبووی- سەرۆکی ڕۆژنامەنووسانی تورك (ئوکتا تاشتی) ئەڵێت: «ئێستا دوای نۆ کاری تیرۆری ڕۆشنبیر و هونەرمەندی کورد ئەو ئاشکرایە کە دەوڵەتی تورك و دەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕاستەوخۆ دەستیان لەم کارانەدا هەبووە».

# حەسەنی قزڵجی

## لە ئەنزی کۆمەڵایەتییەوە بۆ خوێندنەوەی دەقەکان و وەرگێڕان

ئەمساڵ، لە یادی کۆچی دوایی ئەم نووسەرە مەزنەدا کەوتینە خۆمان و لە بارەیەوە دەستمان دایە قەڵەم کە دەکاتە (٢٩/٩/ ١٩٩٨)، بۆ ئەوەی هەرچی دەتوانین لە یادەوەری ئەودا تۆماری بکەین، بەڵام دەبوا ئەم نەریتە بگۆڕین و لە یادەوەری ساڵرۆژی لەدایکبوونیدا کە دەکاتە ١٥/٩/ ١٩١٤ وە بیرمان بهاتایەوە، بەهەرحاڵ حەسەنی قزڵجی لە ڕابەرانی تەنزی کۆمەڵایەتییە لە کورتە چیرۆکی کوردیدا، کۆمەڵە چیرۆکی (پێکەنینی گەدا) گەواهی ڕاست و دروستی ئەم ڕایەی ئێمەیە. لە مێژووی خوێندنەوە و توێژینەوەی ئەدەبیاتی کوردی نوێدا چەند خاڵێکی گەش بۆ ئەم نووسەرە تۆمار دەکرێت، وێڕای ئەوەی باسمان کرد لە بواری لێکدانەوە و ڕەخنەی تێکستە کوردییەکاندا خاوەن قەڵەمێکی بەبڕشت و سەرکەوتوو بوو. لەو ئیندێکسە گچکەیەی ئێمە دروستی دەکەین بەڕاشکاوی ئەمە دیارە. حەسەنی قزڵجی نزیك شاری بۆکان لە دایك بووە، خوێندنی یەکەمجاری لای مامۆستا (مەلا ئەحمەدی فەوزی) بووە، لەم بارەیەوە خاتوو (جۆیس بلسو) پرۆفیسۆری زمانی کوردی لە زانستگای پاریس، نووسیویە: (لە ناو شاگردەکانی مامۆستا فەوزیدا حەسەنی قزڵجی لە هەمووان وریاتر و زیرەکتر بوو، بۆیە مامۆستا فەوزی زۆری خۆش دەویست و زۆر لەگەڵیدا خەریك دەبوو). دوای ئەمە لای مەلا ئەحمەدی تورجانی مامی لەسەر خوێندن بەردەوام بوو، لێرەدا بەکورتی قۆناغەکانی ژیان و خەباتی سیاسی و ئەدەبی ئەم نووسەرە دیاری دەکەین.

١- ڕۆژگاری تێکۆشان و دروستکردنی کۆمەڵەیەکی نهێنی لە مەڵبەندی موکریاندا کە سیاسی و ڕووناکبیری بوو بۆ ژیانەوە و بەخۆدا هاتنەوەی زمان و مێژوو ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی. دیارە ئەمە پێش (ژ.ك ١٩٤٢) کە بریتی بوون لەم کەسانە (مەلا ئەحمەدی فەوزی، قازی محەمەد، شێخ ئەحمەدی سیریلاوا، مەلا محەمەد، حەسەنی قزڵجی). کارێکی گرنگی دیکەش لای ئەمان ئەوەبوو کە ئەو گۆڤار و ڕۆژنامەی لە کوردستان عێراق و شام دەردەچوون وەدەستیان دەهێناو لە مەڵبەندی خۆیان بەخشیان دەکرد و خەڵکیان لێ هۆشیار دەکردەوە.

٢- پلەی دووەمی کاری خەبات و ژیانی قزڵجی لە دامەزراندنی کۆمەڵەی (ژ.ك)ەوە دەست پێ دەکات، کە چالاکی ئەو لە بەرچاوان بوو.

٣- کاری ئەو لە رۆژگاری کۆماری میللی کوردستاندا لە مەهاباد کە هەم هەڵسووڕانێکی سیاسی بوو هەم نووسەرێکی (رۆژنامەی کوردستان) و گۆڤاری (هەلاڵە) بوو.

٤- لە دوای لە نێوچوونی کۆمار ئەویش وەك زۆربەی سیاسەتمەداران و رۆشنبیران پەڕوازە و ئاوارەی گەرمێن بوو، کە لە کوردستانی عێراق لە سێتەك شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی ئەمر بوو بەخەمخۆر و داڵدەی دان و ئەوانی حەواندەوە، هەر لەو سەروبەندەدا ئەو گرووپە کەوتنە خۆو ساڵی ١٩٤٨ (١٣٢٧ی هەتاوی) گۆڤاری (رێگا) یان چاپ کردو گەیاندیانە مەڵبەندی موکریان و بڵاویان کردەوە، کە بریتی بوون لە (شەهید عەبدولڕەحمان زەبیحی، غەنی بلوریان، محەمەدی شاپەسەندی، حەسەنی قزڵجی).

٥- لە سەردەمی رژێمی پاشایەتیدا عێراق لە پەنجاکاندا، بۆ خۆ حەشاردان ناچار بوو لە ناوچەی (بازیان) دەست بکات بەجووتیاری و کاری کشتوکاڵ، دوای چەند ساڵێك گەیشتە بەغداد، لەوێ هێننە ئەماوە کە دەستگیر کراو لە تەك عەبدولڕەحمانی زەبیحیدا درانەوە بە رژێمی پاشایەتی ئێران و خرانە زیندانەوە، بەهەر هۆیەك بێت خۆی دەرباز دەکات دێتەوە کوردستانی عێراق و لە دوای شۆڕشی تەموزی (١٩٥٨) لە بەغدا دەمێنێتەوە هەتا ساڵی (١٩٦١) کە راستی رژێمی عەبدولکەریم قاسم خۆی وە دەرخست و بەرەو دیکتاتۆریەت چوو، ناچار هەلات و هەلێکی بۆ رێکەوت خۆی گەیاندە (سۆفیا)ی پایتەختی بولگارستان و، لە بەشی فارسی رادیۆی سۆفیا بووە کارمەند و پەیوەندی گرت لە تەك حیزبی تودەی ئێران.

٦- لە رووخانی رژێمی شا کەڵکی وەرگرت و گەڕایەوە زێدی رۆژنامەی (دەنگی مەردوم)ی چاپ و بڵاوکردەوە، هەتا رۆژی شەهیدبوونی لە ١٩٨٤/٩/٢٩.

## بەرهەمە ئەدەبییەکانی قزڵجی

کارە ئەدەبییەکانی حەسەنی قزڵجی دەکرێن بە سێ بەشەوە:

١- تەنزی کۆمەلایەتی لە کورتە چیرۆکدا.

٢- خوێندنەوەی تێکستە کوردییەکان و سەرنجدانی ڕەخنەیی.

٣- وەرگێڕانەکانی لە زمانی (بولگاری) و فارسی و عەرەبییەوە بۆ زمانی کوردی. بەتایبەتی ئەو ساڵانەی کە لە وڵاتی بولگارستان بوو، لە (سۆفیا) ژیا و بولگارییەکی باش بەئاخافتن و نووسین فێر بووبوو. کاتێ گەڕایەوە بۆ عێراق گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان هەتا ساڵی (١٩٨٤) لە بەرهەمە زیندووەکان و وەرگێڕاوەکانی قزڵجی بەهرەمەند بوون و بێ بەش نەبوون.

کۆکردنەوەی بەرهەمە پەرت و پەرەوازەکانی ئەم نووسەرە مەزنە بۆ دەربازکردنیان لە دەست لە ناوچوون و نەمری پێ بەخشینیان کاری هەموو دڵسۆزانە، من لای خۆمەوە لە ئەرشیفی تایبەتیمدا ئەم بەرهەمانەیم پاراستووە و نیازمەندم لە دەرفەتێکی نزیکدا چاپیان بکەم و خوێنەری کورد لێیان بێ بەش نەبێت.

# دارستانی ئەو بنارە

## ١- گیروگرفتی تاقیکردنەوە:

لە تاقیکردنەوەی شیعری کلاسیدا شاعیری کلاسی خۆی و تاقیکردنەوەیەك بووە، گۆڕان و داهاتنێکی ئەوتۆ لە تاقیکردنەوەکەیدا لە قۆناغێکەوە بۆ ئەوی تر ڕووی نەداوە کە هێڵێکی بەیانیی لە ناوەندیاندا دابنرێت. خۆ ئەگەر سەبارەت بە ناوەڕۆك و قووڵبوونەوە و خەستبوونەوەیەکی لە لایەکی -غەزەل و بابەتەکانی کۆمەلایەتی و سۆفیزمیدا- بەسەردا هاتبێ و لە ڕەوتی شیعرەکانیدا -لە دیوانەکەیدا- بسەلمێنێ ئەوا سەبارەت بەفۆڕم و داڕشتن و تەکنیکیان لە سەریەك بنچینەو یاسا ڕۆیشتووە. ئەوە ئەبێت کە ڕێکەوت وەهابوایە یاخود شاعیر بەئارەزووی خۆی ویستبێتی لە -بەحرێکی عەرووز-ەوە چووبێتە سەر -بەحرێکی تری هەمان عەرووز- لای ئەوانەش کێشی خۆماڵی فۆلکلۆریان لە ناوچەی هەورامان بەکارهێنا وەك -بێسارانی-و مەولەوی-و هەندێکی تریش زۆر کێشەکان یەك چەشنن و کێشی فۆلکۆری ئە بڕگەییەکە زاڵە. (خوێنەر نەبێ ئاگاداری ئەوە بێت من لێرەدا کاتێ باسی کلاسی م کردووە ڕۆمانسییەتی بێسارانی و - ڕۆمانسییەتی سۆفێنزمانەی مەولەوی-م لە یاد نەچووە ئەمە نابێتە دژوار).

بەلام کە لەو قۆناغە تێپەڕ بووین تاقیکردنەوە نوێیەکانی شیعری تورکی بەتایبەتی -

ئینگلیزیش هەر لە ڕێی تورکییەوە لە سالانی بیستەوە تێکەڵیی تەواویان لەگەڵ شیعری کوردی لەگەڵ شیعری کوردی بەتایبەتی لە ڕووی فۆرمەوە پەیدا کرد ئیتر قۆناغ چووە قۆناغی تاقیکردنەوەوە بۆ نوێکردنەوە و نوێکردنەوەی بەردەوام - گۆران و شێخ نووری کە شیعریان لە بەرچاوانە و ئەم دەست و ئەو دەست ئەڕۆن و دێنەوە لای خوێنەری کورد نموونەی گەش و زیاتری باری ئەم تاقیکردنەوەیەن. ئیتر لەوانە هەتا ئەگاتە دڵدار و بەختیار زێوەر و دیلان و کامەران و (ع. ح. ب)و کاکەی فەلاح و جەمال شاربازێڕی و شێرکۆ بێ کەس

...هتد. ئەم قۆناغی تاقیکردنەوانەن چ لەلای شاعیر خۆی چ لەلای سەرانسەری مێژووی نوێی ڕەوتی شیعری کوردییەوە بەگشتی.

بۆ نموونە- شێرکۆ بێ کەس- تاقیکردنەوەی خۆی هەیە و قۆناغە شیعرییەکان هەر بەدیوانەکان خۆیان ڕاستی قسەمان دەرئەخەن.

بڕوانە: تریفەی هەڵبەست -کەژاوەی گریان- من تینوێتیم -ئاسک-کازیوە- نا لێرەدا و ڕۆشنایی ئەم کورتە باسەی سەرەوەمان بۆ قۆناغ ئەگێڕینەوە لای -نەوزاد ڕەفعەت- و دیوانەکەی.

لە دارستانی ئەو بنارەدا هەر لە شیعرە چوار دێرییەکەیەوە هەتا درێژترین شیعریان یەك تاقیکردنەوەن. ئێمە حیسابی ئەوە ناکەین کە مەرجە یەك دیوان یەك تاقیکردنەوە بێت. دوو بەرگی دیوانێك یەك تاقیکردنەوەی سەربەخۆی تەواو بێت. چونکە دیوانمان هەن لە تاقیکردنەوەیەکی شیعری زیاتریان تێدایە. وەك -بەهەشت و یادگار-ی گۆران -دیوانی دڵدار- زریان-ی ئەنوەر قادر... هتد.

ئەم تاکە تاقیکردنەوەیەی نەوزاد گیروگرفت ناخاتە ڕێگەی ئەوەی کە نەتوانرێ لێی بکۆڵرێتەوە و باسی لێوە بکرێ. بەڵام گیروگرفتی قۆناغی شیعری و گۆڕانە هەمیشەییەکانی سەردەم یەك هەڵوێستی شاعیرانەی ئەومان بۆ دروست ئەکەن.

بەهەرحاڵ تەنیا لە تاقیکردنەوەکەی -نەوزاد-دا لایەنی بەرفراوان و زەمینەی لەبار و پتەو هەیە بۆ ڕاکێشانی قەڵەمی ڕەخنەگر و لێکۆڵەرەوە هەتا کاری تیادا بکات. هەندێ جار تێپەڕینی ساڵ و کارسازی لە پێشکەوتنی شیعردا یەك ناکەون هاوشان ناڕۆن. واتە وەها ڕێ ئەکەوێ کاری چوار پێنج ساڵی شاعیرێك یەك تاقیکردنەوە بێت لە هەموو ڕوویەکەوە. وەها ڕێ ئەکەوێ کاری لە چوار ساڵیش کەمتر دوو تاقیکردنەوە و دوو

هەنگاوی شاعیر بێت. ئەم حیساباتە پێوانەیەکی تیئۆری ماتماتیکی نین یاسا بن و هەر شاعیرێك خانەی خۆی تێدا گرتبێت. لە -دارستانی ئەو بنارەدا- دەربڕین -نسلویی شیعر وتنی شاعیر- فیکری شاعیر هەر لە -مەرۆ-و مەرگ لە زامی مندا دەڕوێ- و سووتان لەسەر هێلێکی هاوشان سەر بەیەك تاقیکردنەوە لەگەڵ شیعرەکانی - مەرگی کەژ - و - چەمی بێ دار- و -دۆڵی کپ - و نێواران هەور دەسووتێ-دا ئەڕۆن بەردەوام گوزارە لە خواست و مەبەستی شاعیرانەی شاعیر ئەکەن. مەبەست لەمە ئەوە نییە کە پێشکەوتن و داهێنانی نوێ و زیاتر گەش ڕوانینی شاعیر لە تاقیکردنەوەکەدا دەست نەکەون بەڵکو بەپێچەوانەوە جیاوازی زۆر لە نێوان -مەرگ لە زامی مندا دەڕوێ- و -نێواران هەور دەسووتێ-دا هەیە و جێ دەستی کارامەیی -نەوزاد-و هەڵچوونی شاعیرانە و خەستبوونەوەی موعانات و وردبینیی لە کێشە نەتەوەیەکەیدا دێنە پێش چاوی خوێنەر. ڕووداوێکی درامیی نەتەوەکەی کاری تێ ئەکەن و شیعری جوانی پێ ئەڵێن. چەمسەرەکانی بیروبۆچوونی خۆی ون ناکات و داناخزێتە ناڵۆزی و دژوارییەکی وەهاوە کە -چەمی بێ دار-ی تاقیکردنەوە تەمەن کورتەکەی چوار پێنج ساڵی بوەستێنێ و لێڵ و بێ تامی بکات.

## ٢- وێنەی شیعریی و یەکێتی بابەت:

-نەوزاد ڕەفعەت- یەکێکە لەو شاعیرە لاوانەی لە شیعرەکانیدا وێنەی شیعری و وەرگرتنی دیمەنی ڕۆمانسیانە زۆر بەکار ئەهێنێ. ڕواڵەتەکانی سروشت - باران و بەفر - با و زریان و خوڕەی چەم و لەرەی گەڵا و دیمەنی دارستانی بنار چیا و ئاسمان و دەریا و لووتکەی چیا و هەور و تەم تێکڕا تێکەڵ بە جووڵە و بزواندنە جۆربەجۆرەکانی مرۆڤ ئەبن و ئەبنە هێما و ڕێ نیشاندەری ناوەڕۆك و چۆنێتی بیرکردنەوەی شاعیر. جووڵە و بزواندنە جۆربەجۆرەکانی مرۆڤیش بریتین لە هەموو ئەو هەست و ئەست و کردەوانەی کە تیایدا ئاشکراو شاراوە دەرئەکەون وەك -فرمێسك و گریان- پێکەنین و خەندە- بیرکردنەوە و تێڕامان- یادکردن و کپی نارامی گەشتی شەقامی تەنیایی و سەرنجی تۆخ لە پۆلە باڵدار درەخت و دەریا- بیرەوەری ڕۆژانی ڕابردوو چاوەڕوانی ئەو خۆشی و ناخۆشیانەی داهاتوو لەگەڵ خۆی ئەیان هێنێ. کەواتە هاوکێشەکە بەم جۆرەی لێ هات- ڕواڵەتەکانی سروشت، جووڵەی مرۆڤ- ئەبێتە شیعری نەوزاد.

هەندێ ڕەخنەگر لەو بڕوایەدان کە وێنە سروشتییەکان و خەیاڵە ڕۆمانسییەکان

ناتوانن بکرێنە کەرەستەی شیعری کۆمەڵایەتی تەنانەت شیعری سیاسی. هەرچەندە من لەگەڵ ئەم ناو لێنانی شیعرەشدا نیم بەکۆمەڵایەتی یاخود بە سیاسی –شیعر یەك جۆرە–. شیعر ئەو جیهانەیە لە هەموو لاوە خەمی مرۆڤ و خۆشییەکانی –کارەساتە درامییەکانی سروشت و هێمنی و ئاسایشی ئەو ئەبن بەرووبار و ئەرژێنە دەریای شیعرەوە. لە –دارستانی ئەو بنارە–دا شیعرێکی تێدا نییە بۆ چێژی تاکە کەسێك وترابێت. وێنە رۆمانسییەکان ناچنە بەرەی شیعری رۆمانسییەوە بەواتای رۆمانسییەت بەڵکو شاعیر سوودێکی تەواوی لەم رێبازە وەرگرتووە لە رووی خەیاڵ و وێنە و بەکارامەیی توانیویتی بیگونجێنێ لەگەڵ بیرکردنەوە و هەستی نەتەوەیی خۆیدا. سەراپا ئەدەبێکی واقیعی بەزمانێکی رۆمانسیبیانە دروست کردووە. لە وێنەکاندا یەکێتی و گورج و گۆڵی بابەتی کۆکردووەتەوە و کردوونی بە هەوێنی واتا و مەبەستی خۆی. ئەو مەبەستانەی رەنگدانەوەی کەسێك یاخود هەموو کەسانێ کۆمەڵێك بن و لەژێر دوو چەوسانەوەدا چاو هەڵبێنێ، تێ بکۆشێ و نەخشەی دواڕۆژ بکێشێ.

(من و تۆ ئەو شەوە فێری
عیشقی خاك و
ماڵ و دەواری خۆمان بووین
کە تا بەیان
لە دەشتەکاندا ماینەوە و باران لێی داین)

ئەنجامی عیشق و شەیداییەکەی ئەوزاد وەك شاعیرێك و کەسێکی ئەم نەتەوەیە لە هەڵچوونی دەروونی خۆشەویستەکەی بێ پایانە و هاتووەتە بوون. باران–لای شاعیر زیاتر لە دەلالەتێکی شاعیرانە بۆ مەسەلەیەك ئەبەخشێ:

(ئەو شەوانەی پیرەداری یادەکانت چرۆ دەکا
بارانێکی خوڕ دادەکا
باران ناهێڵێ بێ چەتر بێمە دەرێ و
خەمی دووریت لە شەقامەکانا هەڵڕێژم)

بارانی شیعرەکانی ئەوزاد لە کارەساتێکی درامی ئەچن. هێمن و لەسەرخۆ نابارێن، گەڵا و گوڵ ئەمرێنن، لق و چڵ ئەشکێننەوە. ئەبنە لافاو و تۆوی کێڵگەکان ڕائەماڵن. ئەبن بە زریان– و رێ لە رێبوارەکان ون ئەکەن. چەترێك لای دڵدارەکەی هەیە، کە زۆرداری

باران و تووڕەیی زریان زۆری بۆ دێنێ، ناچار پەنا دەباتە ژێری. تۆف و باران- دەرگاکەی دەهەژێنێ و ئەمیش دەرگاکەی دەکاتەوە دارستانێکی ڕەش دێتە بەرچاوی.

بەو پێیە باران لای شاعیر ڕواڵەتێکی سروشتی نییە بەڵکو کارەساتە بەسەر شاعیر و نیشتمانەکەیدا ئەبارێ. بەلای منەوە ئەبوایە ئەوزاد- دەورێکی تری بەباران بسپاردایە و هەر هیچ نەبێ لە ڕەمزە ئاساییەکەی خۆیەوە بەکاری بهێنایە. کە باران ڕەمزی پیت و بەرەکەتە ڕەمزی خێر و سامانە بۆ مرۆڤ- چونکە خاکی مردوو ئەژێنێتەوە چەمی وشك پڕ لە ئاو ئەکاتەوە کانیاوەکان سەرلەنوێ ئەتەقێنێتەوە. لە هەندێ جاریشدا بارانی بەنیشانەی کەرتبوون و بڵاوبوونەوە و ونبوون بەکارهێناوە.

(نزیك دیارن و هەرچەند ئەڕۆم نایانگەمێ
کە بانگیشیان ئەکەم دەنگم
وەك ڕەهێڵەی بارانێك هەڵئەوەرێ)

گۆڕینی دەلالەتی ئەم بارانە جۆرە گێژاوێکی دروست کردووە. لە بەکارهێنانیدا لەگەڵ ئەوەدا سیفەتی خێری ئەداوەتێ بۆ کەرتبوون بەکاری هێناوە ڕەمزیش نین بۆ کارەساتێکی درامی وەك شۆڕش و تەقینەوە و ژیانەوە.

لە تێرامان و وردبینی شاعیردا پێویستە ئەو ڕواڵەتە سروشتییانەی بەکاریان ئەهێنێت دەلالەتێکی دیار و ئاشکرا وەربگرن. بۆ نموونە باران لە شیعری -هەوری پایز-ی گۆران-دا نیشانەی گریانێکی بێ ئامان و بە کوڵە، کە ئاسمان بۆ پایز و خاك ئەگری. ماتەمی پایز لای گۆران بە تنۆکە گەورەکانی پەڵەی پایزدا دەرئەکەون:

(تەبیعەت زەرد و ژاکاوە لە حاڵی گیان کەنشتایە
نیشانەی ماتەمی پایز لە فرمێسکی درشتایە)

هەروەها (باران لای-سەیاب- جارێك خەمە جارێکیش ڕەمزی شۆڕشگێڕێکی سروشتییە. شۆڕش لای بەدر کارێکی سروشتی و چاوەڕوانکراو بوو کە ئەبوایە ڕووی بدایە وەك چۆن باران دیاردەیەکی سروشتییە و هەموو ساڵ ئەبێ دابکا)[1]. بڕوانە شیعری -المطر-ی سیاب...

(هەر لەو کاتەوە کە منداڵ بووین
هەور بەری ئاسمان ئەگرێت و
باران دائەکات-)

لە وێنەی شیعریەکانی شاعیردا یەکێتی بابەت بەدیارترین شێوە بوونی خۆی سەلماندووە- ئێواران هەور دەسووتێ- و -مەرگی کەژ- لەگەڵ -هەڵگیرسان- و -چەمی بێ دار-دا ئەچنە سەر یەك ڕێگاو ڕوو لە ولاتێك ئەکەن. باری کۆستی ئەم بۆ قورسە؟ چەمی ئەم بۆچی وەك ئەو چەمانە نین کە ئارام و لەسەرخۆ لەژێر شینایی ئاسمانی بەرین و لە کەنار درەختە سەزەکاندا تێ ئەپەڕن و بۆچی ماسی تیادا سەرگەردان و بێ هێلانە نابێ؟ ئەمیش شەو هەتا بەیان نێشکچی و عاشقی ڕووبارێکی وەهایە:

-ئەو ڕووبارەی خاك لافی پێوە لێ ئەدا
ئەو ڕووبارەی
مرۆڤ چۆکی بۆ دائەدا-

-باری کۆستی ئەم- ئەوەندەی واتای جوانە و شاعیرانەیە ئەوەندەش پرسیارکردنێکی گران و هێنانە پێشەوەی کێشەیەکی گەورەیە. هەندێ جار کە مرۆڤ تێك ئەشکێ و وێران ئەبێ. چرای ڕۆژ لەبەر چاویا ئەکوژێتەوە شیرینی ڕووبارە ئەبێت بەزووخاو و ئەڕژێتە دەروونیەوە. ئینجا هەست ئەکات- باری کۆستی ئەم گەورەیە- کابووس- چییە؟؟ هەوای پاك و پیس کامەیە؟ مرۆڤ بۆ هەندێ جار باخ و سەوزایی دونیای لێ ئەبێتە بیابان؟ بۆ هەست ئەکا هەرخۆیەتی و دەنگ هەڵ ئەبڕێ و هاوار ئەکا و هەر خۆیەتی؟ کەس نایەت بە دەنگیەوە!! کەس فرمێسکی دڵسۆزی بۆ نارێژێ.

(کێ کەرتێکی شاخی کۆڵی من ئەڵ ئەگرێ
تا بزانێ باری ئەم کۆستە چەند قورسە
تا بزانێ بۆ چەمی من تا بەرەبەیان بێ دارە و
دەڕوا و دەگرێ- دەگرێ و نارام نابێتەوە)

ئەم یەکێتی بابەتە لە تاکە شیعرێکدا بێت یاخود لە سەراپای شیعرەکانیدا یەکێکە لە هەرە مەسەلە گرنگەکانی شیعری ئەمڕۆی کوردیمان -لەناوچوونی- گەلێك گیروگرفتی بۆ لێکدانەوەی ڕەخنەگرەکان دروست کردووە هەندێ جار نەبوونی- ڕاستەوخۆ- ئەبێتە هۆی دیارنەی دژواری لای شاعیر. بەلام لای ئەوزاد- لە ئێواران هەور دەسووتێ-وە هەتا شیعری- وێنەکان کۆ دەبنەوە خۆیان هەڵدەبژێرین. کامیان لە هەمووان جوانتر و هۆشیارترە دێتە پێشەوە و ئەبن بەشیعر. لەم سەردەمەدا شیعر پەل هاویشتن و شمولیەتێکی گەورەی هەیە کە ناوی درەختێك دێتە شیعرەوە هەر لە باران و ئاسمان و

ڕووبار و مرۆڤ و باڵدار و پایز و زریان و خۆشەویستی و فرمێسك و بەیەك گەیشتن و دابڕان حەز لێکردن و تۆران و زۆر شتی تریشی پێوە بەند ئەبێ و لە دەوری کۆ ئەبنەوە.

(ئەمانە سەراپا شەفافیەتی شیعرێك ئەهێنن. شیعر هەیە تەنها جارێك ئارەزووتە بیخوێنیتەوە. لە پاش ئەو جارە ئارەزوویەك نییە پاڵت پێوە بنێ هەتا بچیتەوە سەری. شیعری وەهاش هەیە ئەگەر هەموو ڕۆژ بەسەریا بچیتەوە هێشتا تام و چێژی خۆی نادۆڕێنێ. لە شیعری کوردیدا نموونە بۆ ئەمانە زۆرن)

وەك- شیعرەکانی مەولەوی و گۆران و ئەنوەر جاف -ئەوزاد-یش وەك تاقیکردنەوەی یەکەمی هەتا ڕادەیەکی باش توانیویەتی ئەو سەرکەوتنە بەدەست بهێنێ:

(ئەی مرۆڤی بەفرستان نشین
تۆ فێر بووی پێش وەی
زریان ڕات پێچێ
خۆت بنووسێنی بە بەردێکەوە
پێش وەی ڕەهێڵەی باران داکا
خۆت بخزێنیتە ئەشکەوتێکەوە)

یاخود ئەم نموونەیە:

(من لەو دیو تەمو مژەوە
باوەشێك گڵۆپ ئەبینم دادەگیرسێ
تۆ ئەبی کەێ گوێ لە هەڵبەستی کڵۆڵ و
هەزاری وەك من ئەگرێ؟؟)

- نازم حیکمەت ئەڵێ: «ماوەیەکی دوور و درێژ شەمەم لە شیعری دڵداری نەکردووە ئەمنووسی تەنانەت وشەی -دەروون-م لە شیعرەکانم دا بەکار نەهێنا.

دەمگووت دەروون پێوار و ڕەمزی شوعور نییە هی ئیحساساتە»[٢].

بەم جۆرە نازم حیکمەت لە باسی تاقیکردنەوەکەی خۆیدا بڕوا بەوە ئەهێنێ کە مامەڵەکردنی شاعیر لەگەڵ مەسەلە دەروونیەکان و عاتیفییەکان و ویژدانییەکاندا زۆر پێویستە.

لە -دارستانی ئەو بنارە- شدا -دەروون عاتیفە و ویژدان- کۆ ئەبنەوە بەوێنەی

شیعری و یەکێتی بابەت و مێژووی باری کۆستی قورسی کۆڵی ئەو ئەبنە شیعر. لە شیعرەکانی- مەڕۆ و دەریا شینە و سووتان و دۆڵی کپ و هەندێکی تریشیاندا ئەو ڕەنگانە ئاوێتە ئەبن بەیەک....

(ئەبێ ئاسمان ئەوەندەی چاوی تۆ جوان بێ؟
ئەبێ زەوی بەقەد چاوی تۆ فراوان بێ؟
کوا بژوێن و دەغڵ و زەنوێر
وەك نساری ژێر پەرچەم و
گۆی مەمکی تۆ تەڕ و سەوزن؟
کوا چناری ڕۆخ جۆگەی تێر
وەك گەردن و
وەك بەژن و بالای تۆ بەرزن؟)

لە کاتێکدا کە هەندێ شاعیر لەگەڵ مەسەلەی دڵداری و گیروگرفتەکانیدا یەکانگیر ئەبن و مامەڵەی لەگەڵ ئەکەن و شیعرەکانیان ئەبێتە یەك پارچە پشکۆی ئازار- ئەم پشکۆیە ناخیان ئەسووتێنێ و، سووتانەکە گەورە ئەبێت- هەتا داگیریان ئەکات و لە ئەنجامدا ئەیان ڕووخێنێ و ئەوەستن و ئەکەون. بەلام هەندێ شاعیر هەن توانای ئەوەیان هەیە کە ئەو پشکۆی ئازارەی تەنها پەیوەندی بەخۆیانەوە هەیە بگۆڕن بەئاگرێك لە ژێر خۆڵەمێشێکەوە ئەگرێ کە ڕاستەوخۆ چۆنێتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بە بار و زرووفێکی تایبەتیدا ئەیخولقێنن. شاعیر لەم کاتەدا هۆشیارانە بیر ئەکاتەوە بەوریایی پەنجە لەسەر هۆیەکانی دروستبوونی ئەو بارە کۆمەڵایەتییەدا لە شیعرەکانیدا باسی ئەکات.

-غەسان کەنەفانی- ئەڵێت: «ئێمە دیاردەیەکی گرنگی گشتی هەست پێ ئەکەین ئەویش بوونی پلەیەکی پێشکەوتووە لە بەرانگاربوونەوەی هۆشیارانە کە توانای گۆڕینی ئازاری هەیە بۆ پالهێشت و توانایەکی شۆڕشگێڕی)(٣).

-ئەوزاد-یش توانیویەتی ئەم ئازارە عاتیفییە بگۆڕێ بە بەرهەڵست و توانایەکی گەورەی هەستانەوە. ئەمەش دەستکەوتێکی بەنرخە لە کاروانی شیعری هاوچەرخی ئەمڕۆماندا چونکە بەمە شیعر لەگەڵ ڕەوتی شۆڕشگێڕی نەتەوەکەماندا یەك ئەگرێتەوە و لە یەکترا ئەتوێنەوە.

## ٣- جێ پەنجەکانی -زریان-بە-دارستانی ئەو بنارەوە:

لە مێژووی ئەدەبدا شتێکی دیار و ئاشکرایە کە شاعیرە گەورەکان هەمیشە بەهۆی تواناوە داهێنان و پێشرەویتی خۆیان و کاریگەری خۆیان لەسەر شاعیرانی دەوروپشت و نزیک خۆیانەوە ئەسەلمێنن.

لە لایەن ئەو شاعیرانەوە بەدوو شێوە کاریگەری شاعیرە گەورەکە دەرئەکەوێ، شێوەی یەکەم سوود لێ وەرگرتن و هاتنە ناوەوەی هەندێك ئوسلوبی شاعیرە گەورەکە لە واتای دەربرین و مۆسیقاو بابەتەکاندا لەلایەن شاعیرانی ترەوە، ئەمە لای ئەوان نابێتە لاسایی و دزی ئەدەبی و شاردنەوەی. بەڵام لایەنی دووەم هەیە کە کۆمەڵێك شاعیر شوێن پێی شاعیرێك هەڵ ئەگرن و داهێنان و واتا شیعرییەکانی ئەو هەندێك رتووش ئەکەن و بەکاری ئەهێننەوە. ئەمەیان دزی ئەدەبی و کەم دەسەڵاتی ئەو شاعیرانە روون ئەکاتەوە. لە ئەدەبی کوردیشدا ئەم دیاردەیە شاراوە نییە.

گۆران- بوو بە سەرکردەی خاوەن قوتابخانەیەکی شیعری، زۆر شاعیری تر بەرێگەکەی ئەودا رۆیشتن و دەنگی گۆران لە زۆر لایەنەوە لە شیعرەکانیدا ئەهاتە گوێ. بەڵام ئەمە بەشێوەیەك بوو کە ئەو شاعیرانە لەسەر خوان و سفرەی گۆران ئەژیاون خۆیان شاعیریەتی خۆیانیان دروست کردو پێشکەوتن.

لە دارستانی ئەو بنارەدا -ئەوزاد- لاساییکەرەوە و شوێن پێ هەڵگری ئەنوەر-نییە لە زریان-دا بابەتی ئەوی وەرنەگرتووە و خۆی تێکی هەڵشێلێتەوە بیکات بەشیعری خۆی. بەڵام ناتوانین چاو لەوە بپۆشین کە لەو شاعیرانەی ئەم دواییەدا بەتایبەتی ساڵانی (١٩٧٦ -٧٧- ١٩٧٨) جارویار لەو لاو لادا دەنگی ئەنوەر و ئوسلوبە شیعرییەکەی هەست پێ ئەکرێت.

بڕوانە ئەم شیعرانەی ئەوزاد- (ئێواران هەور دەسووتێ، مەرگی کەژ، دۆڵی کپ، چەمی بێدار). شاعیر لە دیوانەکەیدا تەنها یەك روونکردنەوەی نووسیوە ئەویش ئەمەیە کە ناونیشانی شیعرەکەی ئەنوەر- وەرزی سەرهەڵدانی فەرهاد-ی بەکارهێناوە. ئیتر لە شیعرەکانی تردا بێ دەنگی لەم کاریگەرییە کردووە و ناوی نەبردوون. لێرەدا هەندێك نموونەی ئەم کاریگەرییە ئەخەینە روو:

-ئەنوەر:

(زریان لق و پۆپی دار ئەشکێنێ)

(زریان داری لەبن و بێخ هەڵکێشا)
(کۆترە شینکی نێسك سووکی ژانی مەسیح
بەدەوری کەنیسەی دڵما خول ئەخوات و هەر ئەگمێنێ)
(تێر تێر ئەگریم
پێ ئەکەنم
ئەگریم
کۆچ ئەکەم و ئەپرسم)
(بۆ واماتی بۆ کوێ ئەڕۆی)
(تۆ تەنیا بوویت منیش تەنیا
تۆ ئاوابوویت من ئاوا)
(لە خۆشییا باڵی گرت و هەر خەریك بوو
ڕووت ڕووت بێ هاواریەکرد)
(ئەگەر هاتوو ئەو گڵۆپانەش داگیرسان
لە خۆشییا لەدڵەوە
منیش دەست ئەکەم بەگریان)

ئەوزاد:

(کە زریانم دی ئەدەسرەوت
زێم دی سەری دەدا لە بەرد و هاواریەکرد
(کۆترە باسکە لە دەوری دڵدارەکەیدا
خول دەدات و دەگمێنێ)
(گەوڵە کۆترە شینکەی چاوەکانی
لا دەداتە کامە بنار)
(بۆ واماتی، سبەی شەویش
شۆڕدەبیەوە دۆڵی قووڵ)
(ئەیشگریاوی؟
پێکەنیوم)
(خۆشت دەوێم؟
ئەوا تۆیشم لێ ئاوابووی)

(من لەو دیو تەمومژەوە
باوەشێك گڵۆپ دەبینم دادەگیرسێ)

ئەم کاریگەریە شیعریە لەو جۆرەی یەکەمە کە باسمان کرد واتا شاعیربوون و دەسەڵات و ڕێچکەی شیعری خۆی سەلماندووە شیعرەکانی لە ناو شاعیراندا ئەناسرێتەوە. بەڵام کاتێکیش لە ژێر ئەم کاریگەرییەدا ئەبینرێتەوە ئەمە شتێکی ئاسایی و ڕووداوێکی ئەدەبی نوێیە لای ئێمە بەڵکو لە ڕەوتی ئەدەبی جیهاندا و لە مێژووی ئەدەبیاتیشدا ئەمە هەر بووە و بەردەوام دەبێت. بەو مەرجەی شاعیر ڕۆژ بەڕۆژ بتوانێ خۆی لەو کاریگەرییە ڕزگار بکات و دەسەڵاتی سەربەخۆیی خۆی بەدەست بهێنێ.

## ٤- پۆستەر و دارستانی ئەو بنارە:

یەکێك لە ڕووداوە دیارەکانی ساڵی ١٩٧٨ - دەرچوونی - کازیوە-کەی شێرکۆ بێ کەس- بوو. واتە شیعری پۆستەر. ئەم شیعرانە لە ڕووی ناوەرۆك و پەرەپێدان چەمەکی بیرتیژی لەگەڵ ڕۆیشتنی کاری پێشڕەویەتی شاعیرانەی شێرکۆ بوو. کە وەك شاهیدێکی ڕاستگۆی سەردەمەکەی خۆی ئەدوێ. لێرەدا نامانەوێ بەدرێژی باسی - کازێوە- و شیعری پۆستەر بکەین ئەوەمان هەڵگرتووە بۆ لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ. بەڵام ئەوەی پێویستە بووترێ ئەوەیە کە پێش شێرکۆ هیچ کەسێك ئەم داهێنانەی نەکردووە کازێوە یەکێکە لە کاری داهێنەرانەی شاعیر ئینجا لە هەر سەردەمێکدا کە شیعری بەتوانا و دەسەڵات دەرئەکەوێ شاعیرانی تر هەوڵ ئەدەن سوودی لێ وەرگرن و هەندێکیان ئەکەونە ژێر کاریگەری ئەوەوە. ئەم شیعری پۆستەرە بەجۆرێك ساڵی ١٩٧٨- پەرەی سەند پەخش و بڵاوبوونەوەوە کە زۆر لە شاعیرە باش و دەرکەوتووەکانیش کەوتنە ژێر کاریگەری و نووسینەوە. تەنانەت ئەمە- ڕەفیق سابیر- و -لەتیف هەڵمەت-یشی گرتەوە. کاتێکیش لە دارستانی ئەو بنارە ورد ئەبینەوە هەشت پۆستەر ئەبینین کە حەوتیانی ساڵی ١٩٧٨- نووسیوە و یەکێکیانی ساڵی ١٩٧٧ نووسیوە.

هەشت پۆستەرەکە ئەمانەن: خەون، کەرك، چۆلەکە، دار هەنار، شاعیر، کەپەنگر، کێو، هاتنەوە.

سێ پارچە شیعری کورتیشی تێدایە بەناوی -نامە، تۆ، پەنادان- کە ئەشێ شاعیر خۆی یان هەندێك خوێنەر بەپۆستەری دابنێ بەڵام ئەمانە چ لە ناوەرۆك و چ لە تەکنیکدا پۆستەر نین و ناچنە ڕیزی هەشت پۆستەرەکەی شاعیرەوە.

ئەگەرچی هەشت پۆستەرەکە لە ڕووی شوێن پێ هەڵگرتن و کاریگەری -کاژیوە- وە نووسراوە. بەڵام تایبەتیەت و دەنگی تایبەتی ئەوزاد-ی بەئاسانی تیادا هەست پێ ئەکرێت و دێتە گوێ.

هەشت پۆستەرەکەی شاعیر پڕن لە خەون و هیوای دوا ڕۆژ و ڕاونانی شەو وەدەستهێنانی ڕۆژێکی ڕووناکی سەرفرازی کەسانی ئەتەوەکەی. بەئاستەمێك ڕاوەستان و هیوا براوی خەیاڵێکی پەرتبوونی نییە. ئەمە یەکێکە لە نیشانە سەرکەوتووەکانی دیوانەکە شاعیر کە هەر لەم یەکەم تاقیکردنەوەیەوە سەرەتای دەسەڵات و وزەی شاعیرانەی خۆی سەلماند. لە نێو هاوڕێکانیدا- لە نێو شاعیرەکانی شارەکەیدا توانی لە هەمووان باشتر و زیاتر بچێتە پێشەوە دەنگی شاعیرانەی خۆی بەرز بکاتەوە. وێنە جوانەکانی شاعیر لە پۆستەرەکانیشدا ئوسلوبی شیعری -لیریك- غنائی. خۆی ون نەکردووە و لەسەر بەردەوامە:

(کە باخەوانی باخ سووتاو و
کەشتیەوانی
بەساڵاچوو کەشتی شکاو
خەمبار دەبن خەو دەبینن:
باخەوان دەشتێك دەبینێ دەڕژێتەوە
دارەکانی شین دەبنەوە
کەشتیەوانیش خۆی دەبینێ
تۆڕ هەڵداوێ و
بەدەستی پڕ ماسی و خەندەوە دێتەوە)

**٥- ئەوزاد و هەوڵێکی تەکنیکی لە دارستانی ئەو بارە-دا:**

لەو کاتەوەی شۆڕشی نوێبوونەوەی شیعری کوردی لە بیستەکان بەرەو ژوور دەستی پێکردوو گۆران بوو بە سەرکردەی ئەو شۆڕشە ڕابەر و پێشەوایەکی بلیمەتی لێ هاتە دی- لەو کاتەوە ئیتر بەردەوام تەکنیکی شیعری کوردی لە هەڵچوون و گەشەسەندنێکی بەردەوام و نەوەستاودایە. ئەو بارە تەکنیکییە لەم دواییەدا تەواو لە شیعری کوردی هاوچەرخماندا سەری هەڵداو چەسپی بڕوانە- تینوویتییەکەی شێرکۆ بێ کەس-و پشکۆکان ئەگەشێتەوە-ی ڕەفیق سابیر و- شیعرەکانی سامی شۆڕش و زریان-ی

ئەنوەر جاف و دڵدارەکەم-ی سەلاح شوان-و شیعرەکانی- محەمەد حەمەباقی- لای ئەم شاعیرانە هەریەك هەوڵێکی سەرکەوتووانە ئەنجام دراوە بۆ بەرەو پێش بردنی لایەنی کێش و قافیە و مۆسیقای ناوەوە و دەنگ و حیوار و مەنەلۆژ و یەکێتی بابەت و هۆشیاری وشەی موناسیب بووە بۆ تەعبیرکردن لە بابەتی -مناسب- لێرەشدا ئەگەر بەوردی دارستانی ئەو بنارە بخوێنینەوە هەموو ئەو لایەنە تەکنیکیانەی تیادا ئەبینین، وە بۆمان ئاشکرا ئەبێت کە شیعرەکانی ئەوزاد پێویستی بە لەسەر وەستان و وردبوونەوە هەیە وەك کۆمەڵە شیعرێکی ئاسایی و زۆر لەو کۆمەڵە شیعرانەی ئەمڕۆ دێنە بەردەستمان خۆی ئانوێنێ کارامەیی ئەوزاد لەوەدایە کە توانیویەتی بەوێنەی شیعری مۆسیقای ناوەوە قافیەی هەمەچەشن یەکێتییەکی مەوزوعی لە هەر پارچە شیعرێکدا پێك بهێنێ بەو مەرجەش کە هەریەك سەربەخۆیی خۆی پاراستووە وە هەموو شیعرەکانیش یەك هێڵی بەیانی پێك دێنن و لێکدانەوە و بیرکردنەوەی شاعیر، لە دۆڵی کپ و ئێواران هەور ئەسووتێ و چەمی بێدار و هەڵگیرسان و دارستانی ئەو بنارە-دا ئەو هەوڵە تەکنیکییان شاعیرانە بەکار هاتوون.

ئەمانەش درێژبوونەوەی ئەو هەوڵانەی بوو کە لەوەوپێش لە -مەرۆ- و دەریا شینە-و یادێکی شیرین-دا بەدەستی هێنابوو:

(دەریا شینە
ئەی ڕەنگی چاوەکانی تۆ؟
دیمەنی دووری بناری
هەردوو چیاکان شیرینە
ئەی دیمەنی ئێوارەی چاوەکانی تۆ؟

هەر لەو چەند ڕستەیەدا شاعیر ڕەنگی شینی دەریا و چاوی خۆشەویستەکەی و دیمەنی چیاکان لە یەکتریدا ئەتوێنێتەوە. (کات) وەك دیاردەیەکی زیندوو بەکاردێنێ، ئەویش کاتی ئێوارە و دیمەنی ئێوارانی چاوی خۆشەویستەکەیەتی نموونەی بەرەو پێشەوە چوونی ئەم هەوڵەش بەتایبەت لە -دۆڵی کپ- و هەڵگیرسان و دارستانی ئەو بنارەدا ئەبینرێ. لە هەڵگیرساندا ئەڵێت:

«ئەو گوندانە ڕۆژگارێکی ئێجگار دوور و
ماچی ژێر بەفر بارین و
چاوی تۆم بیر دەخەنەوە

ئەو ڕۆژەم بیر دەخەنەوە
دەواری بە بەیان و ئاوا بوونت بۆ هەڵدام
ئەوینێك بووی
سێبەرت بۆ ئەکردم و ناوت نەدام)

ئەگەرچی نموونەکانی ئێمە لە ناوەند یاخود هەر جێگەیەکی تری شیعرەکاندا دەرهاتووە بەڵام ئەبینین هێشتا زیندوویتی خۆی پاراستووە و ئەو -گوندانە- لای شاعیر ئەبن بەدەلیل و فلیمی خەیاڵ و بیرەوەرییەکانی دێنە پێش چاو. ماچ و بەفرو چاو و دەوارو بەیان و ئاوابوون و عەشقی دێننەوە یاد. مۆرکی کەرەسە و ڕواڵەتە سروشتییەکانی کوردەواری لە شیعرەکانا دروست ئەبن و هەر کەس بیخوێنێتەوە دیمەنی بەرەبەیان و ئێوارانی بەبەرچاودا تێپەڕ ئەبێ: لە بەفر و خێوەت و ڕەشماڵ و گوند و چرا و ڕووبار و بارانا و دارستانی و هێلانە و... هتد. کاتێکیش شاعیر ئەم وشانەی بۆ تەعبیر لێکردنی مەبەست و بیری خۆی بەکارهێناوە نەکەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی ساتێکی شیعری کەم خایانەوە و بەشێوەیەکی -لا شعور- مامەڵەی لەگەڵ وشەدا نەکردووە. وشەکانی وەستایانە چنیوە و مۆسیقای ناوەوەی پاراستووە چونکە -(مۆسیقا لێدانی دڵی شیعرە)[٤]. دڵی شیعرەکانی ئەمیش لە ڕاچەنین و داهێنانی بەردەوامدان. ئەگەرچی لە هەندێ کۆپلەی شیعرەکانی دیوانەکەدا جۆرە بیرێکی -ئایدیالی- ورەبەردان هەیە بەڵام ئەمانە نەیانتوانیوە هەمیشە و لە سەراپای شیعرەکاندا بیری نەتەوەپەرستی و مرۆڤانەی شاعیر داگیر بکەن، بۆیە لە کۆتاییدا ئەڵێم:

«دارستانی ئەو بنارە- سەر بەتاقیکردنەوەیەکی گشتی قۆناغی ئەمڕۆی شیعری هاوچەرخی کوردییە، توانی لە ڕیزی دیوانە سەرکەوتووەکاندا جێگای خۆی بکاتەوە. وە لە تاقیکردنەوەی تایبەتی قۆناغی شیعریی شاعیر خۆیدا بنج داکوتان و زەمینەیەکی پتەوی پێکهێناو دیارە داهاتوویەکی باشتریش چاوەڕێیەتی».

سەرچاوەکان:

١- بين السهاب والبوت -عبد الجبار عباس- مجلة الكلمة- عدد خاص.
٢- هونەری نازم حیکمەت - نووسینی- ئەکبەر بابائیف - گۆڕینی شوکور مستەفا - پاشکۆی عێراق ١٩٧٨.
٣- ادب المقاومة ابعادة، مواقفة- غسان كنفاني.
٤- حسين مردان- الازهار تورق، داخل الصاعقة. ص ١٥٨

# کۆدیتاو هەنگاو

لە سەرەتاوە دەمویست بمگەیەنێتە ئەو قەناعەتەی کە دانی پێدابنێم ئەبێت نووسینەکە -کۆدیتایەکی- تەواو بێت لە هەموو ڕوویەکەوە. بەڵام من لە قسەکەی خۆیدا رەخنەیەکی بچووکم بەرەوڕوو کردەوە. لە پاشدا ئەو رەخنەیە چەندە بچووك بوو هێندە بەرفراوان و گەورە بوو. ئەو خۆی قسەی کابرای ئیغریقی بەنموونە هێنایەوە کە دەڵێت:

«تۆ هەموو ڕۆژ دەچیت بۆ خۆشتن لە ڕووبارێك وا دەزانیت ئەو ئاوە هەر ئەو ئاوەیەو جێگەکەش هەر هەمان جێگەیە بەڵام لە ڕاستیدا ئەو ئاوەی تۆ خۆت لێ شتووە دوێنێ ئەوە نییە و جێگاکەش هەبێ و ئەبێ گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە ئەگەرچی کەمیش بێت»

ڕەخنەکەی من بۆ ئاوەکە نەبوو کە ناگۆڕێ بەڵکو بۆ گۆڕانە کەمەکە بوو.

سەری کڵافەی باسەکە لێرەوە کرایەوە.. ئەو دەیوت دەبێت نووسینەکە کۆدێتای تەواو بێت و پشتی تەواوی بەکاتەکە بەستبوو کەچی -جێگا-کەی ئەکرد بەژێر لێوەوە.

-ئەت بیستووە - پاڵەپەستۆ تەقینەوە دروست دەکات؟!

• تۆ هەر ڕووی سەرەوەی قسەکەت گرتووە! گەر وا ئەبێت کام پاڵەپەستۆ و کام تەقینەوە؟! ئەمە پێویستە دیوی ناوەوەشی بخوێندرێتەوە.

- گوایە تۆ مەبەستت لە چۆنیەتی پاڵەپەستۆکەیە؟! (ڕۆسۆ) و (ڤۆڵتێر) پاڵەپەستۆبوون... ڕووخاندنی (باستیل) تەقینەوەبوو.

• لام باشترە هێندە دوور نەڕۆین و لەم نزیکانەوە نموونە بێنینەوە.

- منیش هەروا

• لە هەنگاوی یەکەمدا چۆن پلانی کۆدێتا ئەدەبییەکە دەکێشرێت؟

- چاوکردنەوە و کارتێکردنی!!

• کەواتە پەیوەندی چاوکراوەیی جەماوەرەکە و ڕادەی وەرگرتنی بیروڕا و ڕێبازی نووسەرانی هەندەران پەیوەندییەکی -طردی-یە تا ئەم زیاد بکات ئەویش زیاد دەکات؟

-ئەمە ڕای منیشە.

• (گۆران)ی ئەمر لە ڕێگای زمانی ئینگلیزییەوە -شیلی- و -بیرون- و -کتیس-ی ناسی. ئیلهامی لێ وەرگرتن.

-بەلام نابێ هۆشیاری و ڕادەی زانیاری و بۆچوونی -گۆران- بۆ ئەو ئیلهام وەرگرتنە فەرامۆش بکرێ

• لەم نزیکانەشەوە -عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی- ئیلهامی بەشێك لە کۆدێتاکەی لە -نازم حیکمەت- وەرگرتووە زۆر هۆنراوەی شاهێدی ئەمەن.

- وەرگرتنەکە گرنگ نییە. چۆنیەتی بەکارهێنانەکەی گرنگە. ئەمە بنەڕەتی کۆدێتاکەیە چونکە هەردوو تای تەرازووەکە دەبێت یەکسان بێت.

• دیارە دەتەوێ زۆر ورد بۆی بچیت بەلام ئەمە کتێبێکی ئەستووری دەوێت؟!

- هەر چۆن بێ بتوانین بگەینە ئەنجامێك مەرجیش ئەوەیە وەك (بلینسکی) دەڵێت: هەقیقەت با وشەی سەرەتا و کۆتایی ئەو چەرخەمان بێت.

• لات وا نییە ڕاکردن لە هەقیقەت ترسنۆکی بێت؟

- لێرەدا مەسەلە نووسینەکەیە و هیچی تر

- تۆ دەڵێی دەبێت کۆدێتای تەواو بێت و من دەڵێم بەشێکی لێ دەمێنێتەوە کە نابێ یاسای کۆدێتاکە بیگۆرێت و هەڵی گێڕێتەوە.

• بەڕای تۆ هەنگاوی یەکەم چۆنیەتی کێشانی نەخشەی پلانی کۆدێتا ئەدەبییەکەیە؟

- بەڵێ... لەسەر ئەمەش پێ دادەگرم و ئەوەی زیاتریش سوورم لەسەری دەرخستنی وێنەیەکی کاریگەری کارەکەیە واتە ئەدیب یان شاعیرەکە. وای ئەبینم ئەگەر ئەو هەموو شاعیرە لە سەرەتاوە لە مانای شیعر و هەڵبژاردنی شاعیرییەتی قووڵ ببوونایەتەوە ئێستا تەنها لە سەدا بیستی ئەو شاعیرانە دەبوون چونکە لەوانەیە شاعیر لە سەرەتاوە هەستێکی کاتی و سۆزێکی دەروونی هەڵچوو بیبزوێنێ بەلام ئایا بیر لەوە دەکاتەوە کە ئەوەی ئەوە دەینووسێت و پێش چاوی دەخات لەسەری حسێبە و هێندە نابات دەبێ ببێت بەخاوەنی ئایدۆلۆژییەتێکی تایبەتی و تا دەگاتە ئەوەی تەنها بۆ شیعر بژی؟!

• یا من پێم وایە بگاتە ئەوەی بڵێ ژیان شیعری تیا نەبێ نامەوێ!!

- زۆر کەمی دەگاتە ئەوە؟؟

• ڕێگای شیعریش سەختە!!

– لەوانەیە ئەو سەختییە هۆی ئەخۆشی وشکبوونەوە و دەست کێشانەوە بێت.

• ڕێی تێ دەچێت

– کەوابێ کاروانەکە جۆرە سەرەدەمێك دروستی دەکات بەڵام چەندیان دەگەنە جێ؟؟

• ئەمە وەڵامی پاش تاقیکردنەوەیە... ئەی ئاخۆ گەیشتووەکان کامیان بەماندوویی و لاوازی دەگات؟؟

– ئەوەیان هۆشیاری و واتای شاعیرە کە خۆی دەزانێت من مافی ئەوەم نییە ڕێگای بۆ دابنێم... بەڵام...

• لە دڵتام... دەزانم دەتەوێ چی بڵێیت. نیازت وایە لە دەست پێکردنەکە بدوێیت...

– بۆی چوویت لەمەشەوە قسەی خاوەن تاقیکردنەوەکە و دان پێنانی خۆی دێنمەوە (حسێن عارف) دەڵێت:

«لە یەکەم جاردا پەرم کرد بەڕۆمان نووسیندا. ئەمەویست ڕۆمانێك لە بابەتی –دایك–ی گۆرکیيا –ئاناکارنینا–ی تۆلستۆی یا –کلۆلان–ی هۆگۆ بنووسم. دەستم پێکرد بەو لە هەموو شت ناوم ناو نووسیم –خێوی گەڕەك– کتومت نموونە– یەك لە کەسانی ڕۆمانەکەی گۆرکی و بەڵام دانیشتووی گەڕەکی –سەرشەقام– لە سلێمانی. لاپەڕەیەك و دە و پەنجام ڕەش کردووەو چەقیم.

لە بیرم ئەماوە چۆن لە فەوتان دەربازی بوویوو تا دوای تەمموزی (١٩٥٨)یش هەرمابوو کە خوێندمەوە تەنانەت بە مستەوای ئەو وەختەشم پێکەنینم پێی هات و دڕاندم.

• ئاشکرایە نووسەر مەبەستی سەرەتای دەست پێکردنی و (خۆ دروستکردن)ە.

– ئەگەر شاعیر یان نووسەر پەلە نەکات و پاش دروستکردنی خۆی بەرهەمەکانی دروست بکات دەگاتە چی؟

• دەستێکی دەبێت لە کۆدێتاکەدا. درەنگ بێتە پێشەوە بۆ ئەوەی زوو نەکشێتەوە خۆ دروستکردنی وای لێ دەکات لە هاتنە پێشەوەکەیدا ئەگەر وەك کارزانێکی بەتواناش دەرنەکەوێ بتوانێ خۆی ڕاگرێ. تا هەر جارەی لە دروستبوونێکی نوێدا خۆی دەبینێتەوە. یان دەبێت بەو شاعیرەی کە –عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی– باسی دەکات و

دەڵێت:

«شاعیر ڕاست وەك ڕووبارێکی بەخوڕە لە چاو دەورەپشتەکەیدا. وەك کۆچەرییە لەو جێگەیەی بۆی ناشێ و کۆن بووە بارگە و بنەی بپێچێتەوە و لە جێگایەکی نوێی شیاودا هەڵبداو سەرلەنوێ پێویستی و کەلوپەلی بەرگری خۆی دروست بکاتەوە لە جێگەی ئەو پێویستی و کەلوپەلانەی کۆن بوون و بۆ ئەو سەردەمە ناشێن».

– کەواتە خۆ دروستکردنەکە ئەنجامی خۆی هەیە؟ بەو مەرجەی ژێر دەستەی –عاتیفە– سالمکەی خۆی نەبێت.

• لە قسەکانتا ئەوە هەست پێ دەکەم کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ بەنووسینە کۆدێتاییەکان و دروستبوونی نووسەرەکەوە هەیە بڵێم زۆر شاعیر و نووسەر ئەو عاتیفەیە بەهەڵەیدا دەبات. ئەوەش سەرچاوەکەی زۆرجار –جوانی–یە چونکە یۆنانییەکان هەموو بیرێکیان بەهۆی کارتێکردنی جوانییەوە کردووەتەوە.

– هێشتا هەموویت نەوت کە ئایا عاتیفە تەنها دەستکردی جوانییە؟ نەخێر عاتیفە زیاتر دیمەنی دڵتەزێن و کارەساتی جەرگبڕ دروستی دەکەن نەك جوانی. لەوانەیە لێرەدا بڵێیت –گۆران– لە ڕۆمانسیەتەکەی (شێللی و کیس)دا بەرامبەر دەم کردنەوەی گوڵێك و وەرینی گەڵایەك ئەوپەڕی عاتیفەی هەڵچووبێ. کەچی (تێنوویێتی گۆران بۆ جوانی تێنوویێتییە بۆ دۆزینەوەی ژیان و دەوری ئادەمیزاد تیایدا وە بۆ گەیشتن بەم جوانییە هەقیقەتە قۆناغ بەقۆناغ بەپێی بەرەوپێش چوونی فیکری و تەمەنی خۆی هەنگاو هەڵدەگرێ). جگە لەمە پاڵەپەستۆیٚ ئازار توانای زیاترە بۆ تەقاندنەوەی عاتیفەی شاعیر نەك جوانییەکی کۆشی ئارامی. چونکە یاسای سروشت ناهێڵێ بووکی جوانی تاهەتایە چاو لە بەرامبەر ڕووناکییەوە هەڵبێنێ وەك گۆران دەڵێت:

«ئەمەیە دیمەنی پاش وەشتی نیسان
پێ شێلی ستەمە گشت شتێکی جوان»

• ئەی کارتێکردنەکە... بەلای تۆوە وێنەگرتنەوەیە یاخود مادەی کیمیاوییە بۆ بەهێز و پێزکردنی؟

– ناتوانم بڵێم کارتێکردنێك نییە لە ئەدەبدا کە وێنەگرتنەوە بێت ئەمە بەبارێکی تردایە چونکە ئەشێ –سارتەر– سوودی تەواوی لە –ئەراگۆن– و –مایکۆفسکی– وەرگرتبێ. یان –ستیڤن سبندر– هەندێ کەلوپەلی ئەدەبی خۆی لە –نیرودا– خواستبێ. وە

نواندنی وەستایەتی و جۆری بەکارهێنانی وەرگرتنەکە مەرجی بنەڕەتییە بۆ نموونە -پەفتەشینکۆ-نەراگۆن- سەردەمێك دروستی کردن و لە کێشوەرێکدا دەژیان. بەزۆر تاقیکردنەوەی هاویەشدا ڕۆیشتوون. کەچی هەریەك سەرگەرمی تاقیکردنەوە و داهێنانی خۆیەتی و جۆرێکی جیاوازتر ڕووداوەکان پێش چاو دەخەن.

• ئەی حسابێك بۆ بوونی یەك شارستانی و یەك دەروویشت ناکەیت کە بەرهەمی وەك یەك لای شاعیر و ئەدیبەکان دەدەن بەدەستەوە؟

– نەخێر.

• چۆن؟

–وەك وتم جۆری بۆچوون و تیاقووڵبوونەوە و سایکۆلۆژیەتی زاتیی نووسەرەکە ئەمە دەگۆڕێ. ئایا شارستانێتی ئەورووپا چۆن لە بەرهەمەکانی -پەفتەشینکۆ-دا هەیە هەرواش لای -نیلوار- دەرکەوتووە یان وەك لای ئەم دووانە هەیە؟ یان جۆری چارەسەرکردنەکەی جیاوازی هەیە؟ کە بەپێی ڕێبازی فەلسەفی بیر و نووسینی هەریەکەیان دەگۆڕێن.

• بەلای منەوە وەرگرتنەکە دەبێت هەڵبژاردن بێت تا لەگەڵ سروشت و سایکۆلۆژییەتی زۆریەی جەماوەردا بگونجێت.

– ناتوانم بڵێم لە سەدا سەد دەبێت وا بێت. بەڵام ئاخۆ ئەدیب و شاعیرەکەش هەر لە ڕادەی وەعی جووتیار و کاسبکارەکەدا بن ئەی پێشڕەوی و هەنگاونان و کۆدێتاکردن چی بەسەر دێت؟ لە کام سندوقدا قایم بکرێت و بەکام قفڵی پۆلایین دابخرێت و کلیلەکەی لە کام کون و کەلەبەردا بشاردرێتەوە؟!

• ئێستا لەوە دڵنیام کە وەرگرتن و کارتێکردن ئەتوانن بەشێك بن لە هێزی کۆدێتاکە. سەبارەت بەم قسەیەشت ئەمەوێ بڵێم...

لەو کاتەدا کە گەرمەی مشتومڕ و ڕەخنەکاریمان بوو لەپڕ کارەبا کە بڕا و ژوورەکەم تاریك و نوتەك داهات. هەر چۆن بوو چرا نەوتییەکەم دۆزیەوە و لەسەر مێزەکەم دامناو شقارتەیەکم لێ دا، کە داگیرسا چەند لاپەڕەیەکی ڕەشکراوەم دی کە ئەم نووسینە بوو. ئینجا بۆم دەرکەوت بەرامبەرەکەشم کە هەندێ جار سەری بۆ لەقاندم و هەندێ جاریش پەرچی دامەوە و ڕەخنەی لێ دەگرتم تەنها زاتی دووەمی خۆم بووە و کەسێکی تر لە ژوورەکەمدا نەبووە.

سەرچاوەکان:

١- المؤثرات الاجنبية في للشعر العربي المعاصر- د. عبدالرحمن لؤلؤة.

٢- الكتابة عمل انقلابي - نزار قباني- الثقافة العربية - العدد (١٣) سنة ١٩٧٤

٣- کە چیرۆك نەنووسم - حسێن عارف- گۆڤاری بەیان ژمارە (١٤)

٤- سروشت و جوانی لە شیعری گۆراندا- کەمال میراودەلی- نووسەری کورد- ژمارە -٩-

٥- الشكل والمضمون في الشعر العربي المعاصر -دكتور عناد غزوان اسماعيل.

# زمانی دەربڕین و کێشەیەکی سەخت لە خوێندنەوەی

## چیرۆکی -پەریخان-ی محەممەد فەریق حەسەن-دا

لە کاتێکدا هەر چیرۆکێك سەرسوڕمان و پرسیارت لا دروست بکات، هەست بە سەرکەوتوویی یا لاوازی بکەین بۆ ئەو هۆیانە دەگەڕێتەوە کە بوونەتە هۆی دروستکردنی ئەو حاڵەتانە. لەم چیرۆکەدا چیرۆکنووس دوای پێشەکییەکی کورت کە بەرکوڵ یاخود -استهلال-ی پێ دەڵێن دەیەوێ شەرزەیی و بێ ئارامی کەسەکان بەوێنەیەکی هونەری نیشان بدات نووسەر سوودی لە هونەرەکانی سینەما وەرگرتووە. دیالۆگی سەرەتا کە چوار کەس و باوکی پەریخان پێکی دەهێنن وەکو سیناریۆی فلیمێکی سینەماییە. ڕووداوەکان، دیمەنەکانیان مونتاژکراون، کامێرا لە دیمەنێکەوە بۆ دیمەنێکی ڕووداوەکان پەرە پێ دەدەن. چیرۆکنووس زۆرجار سیناریۆی بەشێوەی دیالۆگ و مونتاژ بەکارهێناوە وەك پێشتر لە چیرۆکی – خاچ – و – بووك و زاوا – و – تێکەڵبوونی دیمەنەکان–دا هەیە.

یەکێ لە دیمەنەکانی کۆتایی چیرۆکی پەریخان چیرۆکنووس توانیویە بەشێوازێکی سادە و ساکار بێ گرێ و گۆڵ و لق و پۆی زۆر و لێکدانی چەندین کێشە، وەك کێشەیەك کە سەرچاوەی هەموو کێشەکانە ڕاست و ڕەوان وەك هونەر کارێکی هاوچەرخ بخاتە بەردەمی خوێنەر و حاڵەتی ڕامان و بیر لە خۆکردنەوەی تیادا دروست بکات کە دروستکردنی ئەو حاڵەتانەش لای خوێنەر نیشانەی سەرکەوتوویی چیرۆکنووسە لە کارەکەیدا، دەبێت لێرەدا ئەوەش بەخوێنەر بڵێم کە ئەمە مانای ئەوە نییە وەك چاوی ڕەخنەگر هیچ ناتەواوی و کەمی و کورپەك لە چیرۆکەکەیدا نەبینم. چیرۆکنووس وەك ئەندازیارێك نەخشە و پلان و پەیکەری چیرۆکەکەی خۆی لە پێش چاوی خۆیدا داناوە و زۆر بەکارامەیی کەوتووەتە دروستکردنی بینای چیرۆکەکە. هەموو شت لە دەوری کێشە گەورەکە دەسووڕێتەوە کێشەی شوانێتی ڕێبوار. لەو کێشەیەدا ململانێ -صراع-ێکی سەرەکی بەرپابوو لە نێوان دوو کەسدا کە نموونەی دوو بەرەی کۆمەڵن سمکۆ کە هەر لە سەرەتاوە گومان لە ڕێبوار دەکات و بەمرۆڤێکی ڕاست و دڵسۆزی نازانێت، سەرەتای دروستبوونی گومانەکەی لەوێوە دەست پێ دەکات کە سێیەم کەس دەڵێت: «هەموو گێل نەبووین، ئەوەبوو کە یەکەم مەڕی دێ خورا، سمکۆ گومانی لێ پەیدا کرد، هەر سمکۆمان

تیایە وریا بێ، ئەو ئەبوایە ئێستاش هەر لە دنیای بێ ئاگاییدا تەراتێنان بووا لێرەدا دیارە سمکۆ نوێنەری بەرەی ڕۆشنبیر و هۆشیاری کۆمەڵە، دەوری ئەو تێگەیاندن و ورپاکردنەوەی ئەو خەڵکەیە کە بەسەرهاتەکەیان دەرك پێ ئەکرد وە ڕێبوار ئەگەرچی لەوەتەی شوانە لەو دێیەدا هیچی لە بارەی خۆیەوە بۆ کەس باس نەکردووە بەڵام لای سمکۆی هۆشیار نامۆ نییە و دیوی ناوەوە و ڕاستەقینەی ڕێبوار دەبینێ چیرۆکنووس کێشەی ئەپساو ململانێی نێوان سمکۆ و ڕێبوار وەها بچووك ناکاتەوە کە ئەوەی پاڵی بەسمکۆوە نابێ بۆ ئەو هەوڵە مەزنانەی تەنها لەبەر عەشقی و خۆشەویستی پەریخانەوە بەس. بەڵکو لەو سنوورەی تێپەڕاندووە و هەر دووبارەی زاتی کە خۆشەویستی یەك لایی سمکۆیە بۆ پەریخان و باری مەوزووعی خۆشەویستی سمکۆ بۆ خەڵکی و سامانەکەیان کە ڕانە مەڕەکەیە پێکیەوە گرێ داوە و بەرژەوەندی کۆمەڵی لە پێناوی بەرژەوەندی تاکە کەسیدا نەخستووەتەوە لاوە. ئەرستۆی فەیلەسوف لە کتێبی -علم الطبیعة-دا دەڵێت: هەموو شتێك بەپێی ئەو هێزە شاراوانەی تیایدایە پەرە دەسێنێ، ئەو پەرەسەندنەش گۆڕانە بەرەو کامڵبوون، لەم واتایەوە ئەگەر تەماشای گوزەرانی ڕێبوار بکەین لە یەکەم ڕۆژی چوونە ئەو دێیەوە هەتا ئەو کاتەی خەریکە خەڵکی لە دیوی ڕاستەقینەی بگەین بەرەو پەرەپێدان و بەردەوامبوونی ئەرکە ناپەسەندەکەی خۆی دەچێت کە ئەمەش بەرەو کامڵبوونی کارەکەی دەروات کە گەیشتنە بەگورگان خواردوو دانی خەڵکی لەسەر حسابی پێگەیشتن و دەوڵەمەندبوونی خۆی. کێشەی سەرەکی لە نێوان دوو هێزدایە، هێزی چاکە و هێزی خراپە. سمکۆ نموونەی کەسانی هۆشیار و ڕۆشنبیری کۆمەڵە، ڕێبواریش نموونە و نوێنەری ئەوانەن کە بە شوان و چاودێر و دڵسۆزی خەڵکی دانراون و قەمەری خەڵکی ئەوان دەستنیشان دەکەن، بەڵام لە دیوی دەرەوە پاك و عاشقی و دڵسۆزی خۆیان نیشان دەدەن و لە ناوەوە پیلانی گڵاو ساز دەدەن و نەخشەی ئەهریمەن دەکێشن. ئەم چیرۆکە دەتوانین بەچیرۆکێکی سەر بەڕێبازی ڕیالزمیی ڕەخنەگری دابنێین. لەلایەکی تریشەوە دەتوانین هەر خۆی بەچیرۆکێکی ڕەمزی بزانین چیرۆکنووس لە شوێنێکی بچووکی وەك دێیەکداو لە کاتێکی کەم خایاندا کێشەیەکی سەخت و بەرفراوان و بەشێکی گەورەی مێژوو دیاری دەکات و ڕانە مەڕەکەو پەریخان و سمکۆ ڕێبوار چواندنی ڕێبوار بەگورگ خۆی چەند ڕەمزێکی خاوەن دەلالەتی خۆیانن کە بۆ یەك کێشە بەکار هاتوون. ڕێبوار دەبێ پێش هەموو شت بۆ ئەوەی بەشوانێکی دڵسۆز و پاکی بزانن دەبێ چەند شتێك بکات و بەڵگە وەك عاشقبوونی پەریخان و خۆ گرتن و

ڕاهاتن لەگەڵ هونەردا بەوەی کە بەناوازی جۆر بەجۆر سەرنجی خەڵکی بۆ پاکی و هەست ناسکی و هەستی مرۆڤانەی خۆی ڕابکێشێ، دیارە کاریگەری ئەو ناوازی شمشاڵەی ڕێبوار بووە کە بەو جۆرە پەریخانی ڕاکێشاوە بۆ لای خۆی ئەوتا دەڵێت: «هەر کاتێك خەم شالاوی بۆ هێنابم خۆم داوەتە بەر شەپۆلی شمشاڵەکەی ئەو» بەتایبەتی لەم بڕگانەدا کە بەئاشکرا وێنە هونەرییەکان دەچنە خزمەتکردنی هەر سێ بنەما سەرەکییەکەی چیرۆکەوە واتا وێنەی هونەری دەبێتە بناغە و یاریدەدەری کات و شوێن و ڕووداوی چیرۆکەکە: (سەرنجی قاچی خۆی داو لەرزی هاتێ، قاچەکانی بوون بەهی گورگ، کاتێك بەخۆی زانی لەسەر کوشنەکە هەڵتروشکاوە کە لە ئاوێنەکەوە سەرنجی خۆی ئەدات سەرێکی درێژکۆڵەو لەمووزێکی بارێکی پێوەیە سەر لووتی ڕەش و کەڵبەکانی درێژ خێرا خێرا زمانی دەردەکێشێ و دەیباتەوە ناوەوە لیك بەلمووزیدا دێتە خوارەوە، گورگێکی برسی سەدە تاریکەکان لە ناخیدا دەلوورێنێ. چاوەکانی دەنووقێنێ و دیانکاتەوە، جارێکی دی لە ئاوێنەکەی بەرامبەریەوە سەرنجی خۆی دەدات گوێچکەکانی بەر بنمیچی ئۆتۆمبیلەکە دەکەون قووت و لیکن لە دواشەوە کلکێکی درێژی لێ ڕواوە، دەستەکانیشی بوونەتە دوو چنگی خۆڵەمێشی سەر سینگی بۆر و تیسکن، چاویان لێیە وا دەبێتە کەوە ڕۆژ پەڵە هەورێکی چڕ خۆر و ساماڵ دەشارێتەوە پەز دەمیان ژەندووەتە پووش و سرووت لەپڕ گەلە گورگێك لەو دیو کێف و زۆنگەکانەوە سەردەکێشن.

زۆربەی زۆری چیرۆکی کوردی بریتییە لەو چیرۆکانەی کە کێشەی ژیانی دانیشتوانی دێهاتەکانی کوردستان دەخەنە پێش چاو ئەو کێشەیەی بەلای منەوە لە دوو لقی سەرەکی پێکهاتووە یەکەم پەیوەندی جووتیار و زەوی کە ئەمە خۆی کێشەی بنەڕەتییە دووەمیان پەیوەندی کۆمەلایەتی جووتیارەکە لە تەك دەوروبەریدا، لەو چیرۆکانەدا لە تێکڕایدا جووتیار –(هەروەك خۆیشی وەهابوو)– نەدار و کەم دەست و چەوساو نیشاندراوە، هەر سێ ئەهانەتییە سەرسەختەکە، هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواری پرزەی لێ بڕیوە لێرەدا جێگای ئەوە نییە باسی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان بکەین لە ژێر سایەی ڕژێمی دەرەبەگی و نیمچە دەرەبەگیدا بەلام ئەوەندە هەیە کە سەرچاوەی هەموو گیروگرفتە ئابووری و کۆمەلایەتییەکان لە چۆنیتی واتا لە شێوەی دروستبوون و کارتێکردنی ئەو ڕژێمەوە سەرچاوە دەگرێت، وتمان پەیوەندی جووتیار و خاك زۆر بەهێز و سەرەکی بووە، هەر ئەم پەیوەندییە بووەتە هۆی ئەوەی کە جووتیار هەست بەشوێنی چینایەتی و چەوسانەوەی خۆی بکات و هۆی ژیان و گوزەرانی کە زەوییەکەی بووە هی

خۆی نەبوو، واتا موڵکی ئاغا و کوێخا و بەگ بووە.

بەڵام لەم چیرۆکەی چیرۆکنووس -محەمەد فەریق حەسەن-دا کێشەکە بەپێچەوانەی زۆربەی ئەو چیرۆکانەوە کێشەی ناو چیرۆکەکە واتا کارەسات و ڕووداوەکەی کە دیارە بریتییە لە ناوەڕۆکی چیرۆکی بەریخان فراوانتر دەبێت و پەلوپۆ دەهاوێ بۆ گەلێك کێشەی گەورەتر و هاوچەرخانەوە کێشەیەك تەنانەت ئەوەندە نوێیە ئەوەی حەفتاکانی ئەم سەردەمە لە نزیکە و ئاگادارین و لەناو بوومەتەی ئەو کێشەیەدا زۆریان سەریان ڕۆیوە و یاخود نەك دەستیان بەڵکە ڕۆحیشیان بەو ئاگرە چزاوە. بەلای منەوە چیرۆکنووسی زیرەك و ڕچەشکێن ئەوەیە کە خوێنەر زیاتر بەخۆی بناسێنێت، واتا خوێنەر هەست بەوە بکات کە چیرۆکنووس دەیەوێ پێی بڵێ تۆی خوێنەر کێی، کامەیە مێژووی دوور و نزیکت، ئەمە مێژووی ژیانتە و ئەمەش هەر هیچ نەبێ ژیانی بەسەرهاتەکانی دوێنێی نزیکتە، ئیتر خۆت بناسە!

کە سەرەتا نیشان دەدات و لای دەبات لەپڕ لەوێوە خوێنەر بە پەرۆشەو ئەکەوێتە مەراقی

ئەوەی تەواوی دیمەنی کۆتایی چیرۆکەکە ببینێ کە لە سەرەتادا کەمێکی لێ بینیوە. ئەمە جگە لەوەی کە نووسەر سەرەتای دەست پێکردنی چیرۆکەکەی پاش ئەو -استهلال- بەرکوڵە کورتە دەگۆڕێ بۆ هونەری دیالۆگ و سوود لەو جۆرە تەکنیکە وەردەگرێ ئەمەش بە بارێکی سەرکەوتوویی تێکڕا بەرهەمەکانی ئەم چیرۆکنووسە دەژمێرێت و لەم ڕووەوە هەوڵی داهێنەرانی تایبەتی خۆی بەرچاو دەکەوێت. چیرۆکنووس بەرامبەر لایەنی هونەری لە چیرۆکی بەریخاندا ڕەچاو کردووە گرنگی داوەتێ کە بەڕاشکاوی دەتوانین بڵێین ئەم گرنگی پێدانی تەکنیکە جۆربەجۆرانەی لە شێوەدا بووەتە هۆی دەستگرتن و بەرزکردنەوەی ناوەڕۆك و وەها کاریدەکاتە سەر خوێنەر کە نەتوانێ واز لە کرۆکی ڕووداوەکان و تێکچڕانی کێشەکانی بهێنێ و یەك بین لە چیرۆکەکە بوەستێنێتەوە و تا تەواو نەکا وازی لێ نەهێنێ. وەك پێشتریش وتم هونەری دیالۆگ و مۆنتاژ یاریدەدەرێکی باشن بۆ خوڵقاندنی ئەم حاڵەتە هونەرییە سوود وەرگرتن لە مۆنتاژی سینەمایی وەك هونەرێك یەکێکە لە ڕواڵەتە دیارەکانی گەلێ چیرۆکی ئەم چیرۆکنووسە. لە چیرۆکی بەریخاندا دوای سەرەتایەکی کورت چاوی کامێرا دەچێتە سەر وێنەی ئەو جێیەی کە لە دێکەوە بۆ شار دەکشێ و سەرنشینەکانی بریتین لە کۆمەڵێ لەو کەسانەی دەیانەوێ لە هەقیقەتی ڕێبوار بگەن (جێبە، سهیبەکەی

دێ تەکان دەدات. لەبەر تیشکی خۆرەتاو دەبریسکێتەوە بەدوای خۆیدا گەرداوێك گەڵای وەریو و پەپوولە پایزە گێژ دەدات و پاشان بەئاسمانی بێ پەیدا بڵاویان دەکاتەوە. جێبەکە بێ وچان دەڕوات، هەندێ جار دەکەوێتە ئەدیوی و دەرەوەو دۆڵەکان دەیگرنە ئامێزی. بڕێ جاریش دەشتە بەرینەکان دەبینێتە سەر لەپی دەستیان). وێنەگرتنی ئەم دیمەنی بەرەو شار چوونە دەگوێزرێتەوە بۆ وێنەگرتنی دیمەنی دێیەکە گوندەکەیان نەوبووکێکە شانی داداوەتە سەر سینگی چیا و پاو و پووزی لەناو چۆم و سەرچاوەکانی لای پایندا هەڵکردووە، ئاوی سازگار و پاوەنی زۆر، وەك لە بنەڕەتەوە بۆ ماڵیات بەخێوکردن ڕسکابێ هەموو بەیانییەك خۆر بەپەنجەی زێڕینی خۆی دەیان تابلۆی ئاویی گرانبەها دەکاتە گەردنی کەژەکانی پشتی دێ و بەلاپاڵ و سەهەندەکانا هەڵیان دەواسێ). کاتێ چیرۆکنووس لە وێنەگرتنی سینەمایی ئەم دیمەنە دەبێتەوە دەچێتە ناو بەشێکی نوێی چیرۆکەکەوە ئەویش بە گرنگی پێدانی دیالۆگ. ئەم دیالۆگە لای چیرۆکنووس بەشێوەیەکی هونەری و بەزمانێکی توندوتۆڵ و کوردیەکی باش و جێگەی هونەری گێڕانەوەی گرتووە ویستوویەتی ئەوەندەی بتوانێ لە شێوەی گێڕانەوە -سرد- دوور بکەوێتەوە و لە بڕێ ئەو دیالۆگ بەکاربێنێ. لە سەرەتای ئەم کارەیدا وەك زمانی شیعر و ڕاز و نیازی جووتە عاشقێکی بەپەرۆش و بۆ یەکتری سووتاو دەکاتە دیالۆگ لەمەش تێدەپەڕێ و مەودای دیلۆگەکەی فراوانتر دەبێت و دەچێتە نێوان ئەو چوار کەسەی کە چیرۆکنووس دیاری کردوون، یەکەم، دووەم، سێیەم، بەڵام چوارەم لای ئەم زیاتر مەبەستە چونکە دەرکی بەهەندێ شت کردووە و گومان لە ڕێبوار دەکات بەڵام تەواو دڵنیا نییە! و هەروەها ڕێبوار خۆی لە دوای یەکێ لە کارەساتی مەڕ نەمانەکەدا دەبێتە یەکێ لە لایەنەکانی ئەو دیالۆگە. لێرەدا دیسانەوە هونەری مۆنتاژ بەکاردێتەوە و دیالۆگەکە دەفرتێ و کامێرا دەچێتەوە سەر جێبەکە. ئێنجا ڕۆیشتنی ئەم جێبە لە دێ وە بۆ شار وەك هێڵی سەرەکی و خاڵی ناوەڕاستی بازنەیەك وایە کە هەموو ڕووداوەکان لە دەوری ئەو دەسووڕێنەوە جەوهەری مەبەستی سەرنشینەکانی ئەوەیە بەچاوی خۆیان دیوی ڕاستەقینەی شوانەکەیان ببینن کە ئێستا بەهۆی دزیەوە لە ماڵ و سامانی ئەمان چۆن ژیانێك دەژی: (جێبەکە بەڕێوەیە، سەرنشینەکانی، تامەزرۆن، تامەزرۆن شوانەکەیان لە هەوار و باردۆخی نوێدا ببینن سمکۆ لە هەموویان بەپەرۆشترە و دەیەوێ ڕوو ڕاستەقینەی ڕێبواریان نیشان بدات. جێبی ماندوو و بڕێ جار کە دادێتەوە و ڕووی لە نشێو دەکات و چۆم و چۆمەلان و کارێز دەستێکی تەڕی پێدا دەهێنن و فێنکی

دەکەنەوە. کە هەڵدەستیتەوە دار و شەخسێکی چڕە لەسەرە ڕێیدا بۆ پێشوازی دەستەو ئەزمر هۆیەی دڵداوە).

چیرۆکنووس بە شارەزاییەوە بۆ پتەوکردنی تەکنیکی چیرۆکەکەی سوودی هونەری -مونۆلۆژ- وەرگرتووە. لە دیمەنی خەیاڵ و دالغە و لێکدانەوە دەروونییەکانی پەریخاندا چیرۆکنووس ڕاستەوخۆ سوود لەم هونەرە وەردەگرێ. پەریخان دەیەوێ گومان و ترسی ناخی خۆی بکوژێ و کێشەکانی یەکلایی بکاتەوە لە باری گومانەوە و بچێتە باری دڵنیاییەوە، بەڵام دەبینین کێشەکان ئەوەندە سەخت لە دەروونیا کاریگەر دەبن کە هەر لە باری دڵەڕاوکێ و دوودڵی و گوماندا دەمێنێتەوە! چیرۆکنووس بەم شێوە هونەرییە دەچێتە ناو دیالۆگی شتە شاراوە و بەدگومانەکانی پەریخانەوە! پەریخان لێوەکانی وشك هەڵاتوون، بێ خوڵك و هێز بەدەم زینە خەوەوە لەسەر جێگەکەی تل دەخوات، یادگارەکانی والا دەکاتەوە (لێم بە گومانی بەڵام وەك بیستوومە هەموو دڵدارێك تا دەگاتە دولبەرەکەی بەگومانە. پاشان وردە وردە تەمی خانە گومانی دەڕەوێتەوە. جا من کوا بەینم لەگەڵ کەسی دیکە هەبووە) هەتا دەڵێت: (ئێستاش ڕێبوار لێم بەگومانی بەڵام منیش گومانم هەیە، وەکو تریش کە ڕێی کەوتە ئێرە زوو جێی لە دڵما کردەوە. هەر کاتێك خەم شالاوی بۆ هێنام خۆم داوەتە بەر شەپۆلی شمشاڵەکەی ئەو، کەچی وا تاوانباری دەکەن، سمکۆیش چەند پشوو درێژە، چەند سوورە لەسەر ڕای خۆی) چیرۆکنووس لەم چیرۆکەیدا ویستوویەتی لە شێوەدا هەموو هونەرەکانی تەکنیکی چیرۆکنووسی بەکار بهێنێ بۆیە فلاش باگ و هونەری تەداعی فەرامۆش نەکردووە، پەریخان بەبینینی سیما و ڕەنگ و حاڵەتی نوێی ڕێبوار سەری سووڕ دەمێنێ و وێنەکانی ڕابردوو دەبنە زنجیرەیەك ڕووداوی دڵتەزێن و دەکەوێتە باری گەڕانەوە لە وێنەی درێو و تەڵخ و ژەنگاوی ئێستاوە بۆ خاوێنی و جیهانە پڕ لە خۆشەویستی و سیحرییەکەی ڕۆژانی پێشوو، ئەو وێنە درێو و تەڵخەی ئێستای ڕێبوار و گێڕانەوە بۆ دوێنێی پەریخانەوە ئەم چەند بڕگەیە دروست دەکات جا ئێرگز چییە پەریخان؟ ئەو دەشت و هەڵەتە بەتۆوە جوانن. ئێرگزی ئاسمانت بۆ دادەگرم، بەئیازم ئەوەم زەماوەند بکەین پەریخان).

هەر لە باسی فۆرم و چیرۆکی پەریخانەوە پێویستە ئەوە فەرامۆش نەکەین کە زمان یەکێکە لەو هۆیانەی ڕادەی سەرکەوتن و سەرنەکەوتن هەر دەقێکی ئەدەبی دیاری دەکات، بەهۆی زمانەوە نووسەر کێشە و ڕووداوەکان دەچنێ ئەو فکرەی کە دەیەوێ بیگەیەنێ بەخوێنەر هەر لە قاڵبی ئەو زمانەدا دێتە دێ و دەخولقێ. ئەگەر بڵێین زمان

بەردی بناغە و ستوونی هەر کارێکی ئەدەبیە ڕەنگە تا ڕادەیەك ڕاست بێ، زمان هۆی دەربڕینە، بەرجەستە بیر و هۆش و خەیاڵ دەکات وێنەی هونەری بەهۆی زمانەوە پێك دێ، ئیقاعی ناوەوەی هەر کارێکی ئەدەبی بەهۆی زمانەوە دەتوانێت لەنگەری هارمۆنیی خۆی ڕابگرێت، بۆیە دەبینین ئەگەر چیرۆکنووس بەتایبەتی باشترین بیری لەلابێت نزیکترین مەسەلە لە ناخ و وجودی ئێمە بخاتە ڕوو بەڵام ئەگەر زمانێکی توندوتۆڵ و پاراو و ڕەسەن و خاوێن نەکاتە قاڵبی ڕووداوەکە ئەو قاڵبە هەر خۆی لە ڕووداوەکاندا ئەتوێتەوە و شکڵێکی نوێی پێ دروست نەکات ئەوا ئەو چیرۆکە هەر لە سەرەتای لە دایکبوونییەوە دەمرێت و لای خوێنەر تەئسیرێکی ڕۆحی و عەقڵی بەجێ ناهێڵێ. هەر شاکارێکی ئەدەبی لە جیهاندا بەزمانی هەر نەتەوەیەك نووسرابێت دەبینین لە ڕووی زمانەوە، یاخود لە دەرگای زمانەوە چووەتە ناو دنیای نەمرییەوە ئەگەر نووسەر لە نهێنی و چاك بێژی بنەڕەتی زمانەکەی خۆی شارەزابوو وە کاریگەری زمانێکی جیاوازی لەو زمانە لە کارەکەیدا نەبینرا و ئەگەر نووسەر گەڕایەوە بۆ سەرچاوە ڕوون و لێڵ نەکراوەکانی زمانەکەی خۆی ئەوا گرەوی یەکەم ئەو نووسەرە دەیباتەوە (محەمەد فەریق حەسەن) یەکێکە لەو چیرۆکنووسە کوردانەی کە هەر لە سەرەتای هاتنە ناو کۆڕی چیرۆکنووسی کوردییەوە بە شەقڵ و مۆرکی گرنگی پێدانی زمانێکی تایبەت بە ڕەوتی چیرۆکنووسی خۆی هاتە پێشەوە، ئەگەر ڕادەی سەرکەوتنی چیرۆکەکانی بەدوو هۆی سەرەکی دابنێین بەلای منەوە هۆی یەکەمی ئەو زمانەیە کە بەکاری دێنێ ئینجا هۆی دووەم ئەو فکر و بۆچوونانەیە کە بەو زمانە بەرجەستەی دەکات. لای ئەم چیرۆکنووسە ئەم مەرجی زمانە لە چیرۆکێکەوە بۆ ئەوی تر دەگۆڕێ و گۆڕانەکەش لە مەودای بەرەو پێش چووندایە. هەر خوێنەرێك بەوردی سەرنجی چیرۆکەکانی کۆمەڵە چیرۆکی یەکەمی ئەم چیرۆکنووسە بدات کە ساڵی ١٩٧٨ بەناوی –سێبەری ئەسپەشێ– وە بڵاوی کردەوە و بەراوردی بکات لەگەڵ زمانی چیرۆکەکانی –ڕستێك زەنگیانەی ناوی– و چیرۆکی –خۆرکەوتن– و –چیرۆکی پەریخان– هەست بەو ڕاستیە دەکات کە زمان لای چیرۆکنووس بایەخی یەکەمی دراوەتێ و زۆر خۆی پێوە خەریك دەکات. ئەو وێنە و دیمەنانەی بەوشە و واتای کوردیەکی پاك دروستیان دەکات. کە بنچینەکەی یاخود سەرچاوەکەی لە هەوای پاك و ئاسمان و زەوی بەربڵاوی دەشت و چیا و دێهاتەکانی کوردستانەوە هەڵدەقوڵێن و تێکەڵ بەیەکتری دەبن و تەنانەت هەندێ جاریش بەو زمانە وێنەی شیعری یاخود زمانی شیعر دەخولقێنێ. هەڵبەتە ئەم چەند نموونەیە گەواهێکی

پراكتیكی بێت بۆ سەلماندنی ئەو بیروڕایانەمان- هەر لە چیرۆكی پەریخانەوە وێنەیان لێ دەهێنێن و سەرنجیان بەوردی ئاڕاستە دەكەین: (بێریهان سووسەیان كردووە نێواران كاتێ دەچنە مەڕ دۆشین ڕێبواری شوان وەك پێشوازی لە ئازیزێك بكات هەڵدەكاتە بان بەردە بێری و ڕووە و ئاوایی ئەنگوست لە شمشاڵ دەبزێوێ بەڵام هیچ كام لەو ئاوازانە ناگەنە ئەوەی كاتێك پەریخان دەردەكەوێ فووی پێدا دەكات و دەیلەقێنێتەوە ئەو ئاوازەیان تایبەت و دانسقەیە هەم ئاوازە و هەم هۆنراوە. پەریخان نێواران كاتێك دەچێتە نێو پەزان ڕووی وەك مانگی چواردەی لێ دێ ئاڵ بەردەوریدا خەرمانەیەك نووری سپی پەرژێنێتی. ئەگەرچی پەریخان تازە دەگاتێ بەڵام لەو ئافرەتانە دەچێت كە لە كتێبە ئاسمانییەكاندا ناویان دێت)، (كاتێكیش لە دۆشین دەبێتەوە تاریكی باڵ دەكێشێ هەر شتە و بەوادەی خۆی، هەرمێ كێویلە، قارچك، گوورزەیەك ڕێواس پێشكەش بەپەریخان دەكات تەنانەت قسەی ئەوەیشی لێ دەكەن (پەریخان جامادانییەكەی بۆ هەڵدەیەستێت) لە شوێنێكی لاپەڕەكانی دوایی چیرۆكەكەیدا هەر بەو زمانە پاراو و شیعرییەی خۆی بەجۆرێك ڕێبوار لە مرۆڤەوە دەكاتە گورگ هەروەك خوێنەر بەرامبەر فلیمێكی سینەمایی دانیشتبێ. ڕاستەوخۆ بیر و خەیاڵ و ڕوانینەكانی دەڕوات بۆ ئەو جێگەیە لەوێ بەچاوی خۆی هەموو ڕووداوێكی سەیر دەبینێ: ئێستا با بگەڕێینەوە لای ئەو چەند ڕەمزەی كە چیرۆكنووس بەكاری هێناوە ڕەمزەكان هەموو واقعین و هیچ ڕەمزێكی خەیاڵی و ئەفسانەیی تێدا نییە ئەگەرچی لەگەڵی لە چیرۆكی كورتی ئەم سەردەمەدا ڕەمزی خەیاڵی و ئەفسانەیی بۆ مەبەستی تایبەتی چیرۆكنووس بەكاردێت بەڵام لە چیرۆكی پەریخاندا پەنا براوەتە بەر خەیاڵ و ئەفسانە هەموو شتەكان ڕوویان داوە و بەچاوی خۆمان بینیومانن، بەڵام لێرەدا كۆ دەبنەوە و دەچنە قاڵبی چیرۆكەوە دەبێت ئەو ڕەمزانە كە تەعبیری هەرە ڕاستی ئەو كێشە و ڕووداوانەن بەجۆرێك بەكار بهێنرێت كە لە سنووری عەقڵ دەرنەچن و سنوور -مەعقولیەتی- خۆیان بپارێزن، ڕێبوار وەها لە چیرۆكەكەدا دەركەوتووە كە بەڕاستی پاك و عاشق و هونەرمەندە چیرۆكنووس ڕادەی ڕاستگۆیی ڕێبوار و هونەرەكەی بەجۆرێك نیشان دەدات كە هەرگیز ناتوانین بڕوا بكەین كەسێتی ساختە و دەروون پیس بتوانێ بەو شێوەیە ئەوەندە هەست و خەیاڵی مرۆڤانە و هونەركارانە بێت كە دڵی هەموو كەس بەتایبەتی پەریخان بەو جۆرە ڕابكێشێ و لە لایەكی تریشەوە كاتێك كە ڕێبوار ژیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە بەلاپاڵە تەشوێ تاشەكەدا هەڵدەزنێ هەتا چەكێ لە گوڵی ئەوینی بۆ چەپك بكات و بۆی

بهێنێ گومانێك لای ئێمە نامێنێتەوە كە ئەوی بەڕاست عاشقی ئەبێ بۆ چەپكە گوڵێك كە دیاری بێ بۆ خۆشەویستەكەی ژیانی خۆی ناخاتە مەترسییەوە، بڕوانە ئەم گفتوگۆیە لە نێوان ڕێبوار و پەریخاندا:

ڕێبوار: لەوێشەوە بەلاپاڵی تەشوێ تاشەكەدا هەڵزنام لای سەراورد توێژاڵێك بەفر بەچیاوەیە، چەپكێكم لەم گوڵە بۆ چنیت.

پەریخان: بەڵام ئەو شوێنە زۆر ئەستەمە ڕێبوار، خۆت خستووەتە مەترسییەوە ئادەی چەند جوانە!) ئینجا چیرۆكنووس بەلای منەوە بۆ هەڵبژاردنی ناوێكی نوێی وەكو ناوی –ڕێبوار– كە بێتە شوانێك لە لادێدا و لە شارەوە بۆ لادێ. چووبێت ئەمەش دیسان جۆرە ساردییەك لە چیرۆكەكەدا دروست دەكات و ناچێتە عەقڵەوە لەبەر دوو هۆ: یەكەمیان ئەوی كە ماوەیەكی زۆر لە دێهاتەكانی كوردستاندا ژیابێت دەزانێت كە هەتا ئەم ساڵانەی دوایش ناو ڕێبوار و شوانیش بێت لە كوردستاندا نەبوو شتی وەها ڕووی نەداوە. بەتایبەتی كەسێك نەبووە لە شارەوە بچێتە لادێ و ببێ بەشوان لە لادێ بەپێچەوانەوە شوان لە لادێوە هاتووە و لە شاردا لە دائیرەیەكدا دامەزراوە یا بۆ خۆی كاسبی كردووە. دووەمیش ئەوەیە ماوەیەكی زۆرە لە لادێ شوان نەماوە بەڵكو خەڵكی لە بری شوان بەنۆرە هەر ڕۆژەی چەند كەسێكیان دەبوونە شوانی مێگەل و مەڕ و وڵاخ و بەمەش دەوترا نۆرە شوانێ.

لێرەشدا ئەگەر بۆ مەعقولیەتی ئەوە بگەڕێینەوە كە ڕێبوار بەو چەند سەر مەڕە كە لەو دێیەوە دزیونی و بەپەیكاپ بۆ شاری هێناون توانیبێتی كۆشكێك دروست بكات و سۆپەرێكی لێ بكرێت ئەمەش عەقڵ نایبڕێ، ئەگەر چیرۆكنووس ئەمەشی وەك ڕەمزێك بەكار هێنابێ هێشتا بەفریای ناكەوێ و ناتوانێ بەم ڕەمزە دەلالەتەكەیمان بۆ ڕوون بكاتەوە، ئەمە جگە لەوەی كە ئایا سمكۆ چۆن زانی ئەوە كۆشك و سەیارەی ڕێبوارە و چۆن هەر لە یەكەم ڕۆژەوە وەها ڕێبواری ناسی؟

چیرۆكی پەریخان یاخود بڵێین ئەو شوانەی كە بوو بەگورگ لەو جۆرە چیرۆكانەیە كە خوێنەری وریا هەست دەكات هەروا بەزۆر و دەستكرد چیرۆكنووس شوانێكی نەكردوو بەگورگ، بەڵكە بەشێوەیەكی ئاسایی و بەپێی گۆڕانی ڕووداوەكان و پێویستی حەتمی فكری ناو چیرۆكەكە بەشێوەیەكی هونەری و دوور لە داتاشین ڕێبواری تاوانبار لە بەردم كۆمەڵێ خەڵكی زۆر لێكراو و خەڵەتێنراودا لە هەڵوێستێكی دیاریكراودا هەر كە

دەرگای ئۆتۆمبیلەکەی دەکاتەوە و دەبەوێ لەو دەوروبەرەدا، لە بەرچاو ون بێت هێزێکی گەورەتر لە هێزی شەڕی ئەو خواستە گڵاوەکانی سەر هەڵدەدات و هەر لەوێدا لە ناو ئۆتۆمبیلەکەدا وردە وردە ئەندامەکانی لەشی لە مرۆڤەوە دەگۆڕێت بۆ گورگ، لە پێشەوە قاچەکانی ئینجا کەللەسەری و کلکی لێ دەڕوێ و ئینجا دەستەکانی دەبنە دوو چنگی خوڵەمێشی. لێرەدا بەلای منەوە هێزی نهێنی سەرکەوتنی ئەم چیرۆکە لەم کۆتاییەدا خۆی دەنوێنێ کە چۆن لێ دەبێتە گورگ! بەلام بۆ تەنها گورگ و نابێتە هیچ گیانلەبەرێکی درندە؟ ئەمەش هەر بۆ وریایی چیرۆکنووس دەگەڕێتەوە کە پێکەوە بەستنێکی لۆجیکی دروست دەکات لە نێوان کرۆکی ڕووداوەکەدا کە دزین و خواردنی مەڕەکانە لەلایەن گورگەکانەوە، بوونی ئەمیش بەگورگ هەر دەگەڕێتەوە بۆ باری حەقیقی و کرۆکی ڕووداوەکان. ئەگەر وای دابنێین ڕێبوار نەبوایە بە گورگ ئایا عەقل و لۆجیك قبوڵی دەکرد ببێتە چی؟! دیارە هەر گیانلەبەرێك بێت دەبێ دڕندە و بەکار و نەهەت و خراپ بێت، لێرەشدا هەر لە جێگای موناسبی گورگەکە ئەو کارە بەڕێوە بەرێت. لە دیمەنەکانی کۆتایی چیرۆکەکەدا وەك فلیمێکی سینەمایی وێنەی مرۆڤێك دەبینین کە بەشێوەیەکی هونەری ئەندامەکانی لەشی دەبێتە گورگ، گورگ ڕەمزێکی لەبارە لەوێدا کە نووسەر هێمای زۆر شتی پێ بکات و لە لایەکی تریشەوە دیوی ناوەوە و ناخی ڕاستەقینەی ڕێبوار: ئایا چیرۆکنووس هەر بەوەندە واز دێنێ کە مرۆڤێکە و ڕاستی خۆی دەدۆزێتەوە و ئاوێنەی هەقیقەتی خۆی دەبێت. قۆناغی یەکەم گۆڕانەکەیە لە مرۆڤەوە بۆ گورگ و چیرۆکنووس وێنەیەکی زۆر وردی گورگمان نیشان دەدات بەشێوەی گورگێکی برسی، گورگێکی سەردەمە تاریکەکانی مێژوو، ئەم گورگە دێنی و دیسان هەر لە ڕۆژگارە تاریکەکانی سووچێکی ئەم جیهانەدا نیشانمان دەداتەوە تەنانەت چیرۆکنووس حاڵەتەکانی گورگی برسیشمان دێنێتە پێش چاو لەو کاتانەدا کە خەریکی هێرشبردن و خۆ ئامادەکردنن بۆ کەوتنە ناو ڕانە مەڕ و کوشتن و تالان کردنی هەڵدەوەشێتەوە لەو حاڵەدا بۆ خەڵکەکە دەڕوانێت، بەلای منەوە لەو مەرجانەی کە دەبێت لە هەر چیرۆکێکدا هەبێت هەتا بتوانێ دەرهەق بەخۆی سەرکەوتن مسۆگەر بکات بریتین لە:

یەکەم: ئەوەی کە مەوزوعێکی هاوچەرخ هەوێنی چیرۆکەکە بێت و ئێمەش کە دەیخوێنینەوە کەم و زۆر خۆمانی تێدا ببینینەوە، واتا ڕاستەوخۆ لەگەڵ ژیانماندا بێت وەك لە جێیەکی تردا نووسیم، ئەوەیە کە بەشێوەیەکی نوێ و قووڵتر و بەرفراوانتر بەژیانمانان بناسێنێ و زیاتر خۆمان لە ڕاستەقینەکانی ناخمان